گۆڤاری زانکۆ بۆ زانستە مرۆڤایەتییەکان
ISSN (Print):2218-0222
ISSN (Online): 2412-396X

Vol.28 Issue 2 2024
ID No.1585 (PP 90-108)
https://doi.org/10.21271/zjhs.28.2.5

توێژینەوە

# پرسی کورد لە ڕۆژنامەی داڤاری ئیسرائیلیدا(١٩٧٠-١٩٧٥)

قارەمان حیدر رحمان *
نەوشیروان شریف سعید **

## پوختە

ڕۆژنامەی(داڤار)ی ئیسرائیلی، لە نمونەی ئەو ڕۆژنامانەیە کە هەر لەدوای دامەزراندنی لە ساڵی ١٩٢٥، یەکێک بووە لەو ڕۆژنامە گرنگانە، کە ڕووبەرێکی دیاری بۆ خستنەڕووی پرسی کورد تەرخانکردووە. لەڕێگای سوود وەرگرتن لە زانیاریی سەرچاوەی جۆراوجۆر، لە نمونەی زانیاریی ئاژانسی هەواڵی (ئەسوشیتد پرێس)ی ئەمریکی، یان کەناڵەکانی ڕاگەیاندنی حکومەتی عێراق و شۆڕشی کورد لەناویاندا (ئێستگەی دەنگی کوردستانی عێراق). هەندێکجاریش پەیامنێرانی ڕۆژنامەکە لە پایتەختی وڵاتانی ئەوروپا و ئەمریکا و لە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، لە نمونەی پایتەختەکانی وەک (بەیروت) و (تاران)، ڕاپۆرتی ڕۆژنامەوانیان سەبارەت بەو پرسە ئامادەکردوە. بەم ئامانجەش، نووسەو و پەیامنێرەکانی ئەم ڕۆژنامەیە، وەک (ئیهود یعاری)، (سوفیر دفار)، (جاک موری)، (دیتریش سترونمان)، (بورور شینبرغ)، کاری بەبایەخیان لەم بارەوە ئەنجامداوە. گرنگی ئەم بابەتە دەگەڕێتەوە بۆ نیشاندانی دۆزی کورد لەدیدی ڕۆژنامەیەکی پرفرۆشی وڵاتێکی وەک ئیسرائیل. لە کاتێکدا ئەم وڵاتە لەم ماوە مێژووییەدا، ململانێیەکی سیاسی و سەربازییدا بوو لەگەڵ وڵاتانی عەرەبی بەگشتی، بەتایبەتیش لەگەڵ عێراق و سوریا، کە بەشێکی ناوچە کوردییەکانیان لە چوارچێوەی سنووری وڵاتەکەیان لەخۆگرتووە. هۆکاری نووسینی بابەتەکەش ، پەیوەندی هەیە بە نەبوونی هیچ توێژینەوەیەکی زانستی، لەسەر هەڵوێستی ڕۆژنامەگەری ئیسرائیلی بەرامبەر پرسی کورد، لەو ساتەی ئەو بابەتە هەر لەم ماوە مێژووییەدا جێگەی بایەخ و گرنگی پێدانی ڕۆژنامەگەری جیهانی بوو. دیارە لەم توێژینەوەیەدا کاردەکەین بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارێک، کە خۆی دەبینێتەوە لە لێکەوتەکانی هەڵوێستی سیاسی ڕۆژنامەگەری ئیسرائیلی بەسەر کۆمەڵی جوولەکە بەتایبەتی کوردەکانی ئەم وڵاتە، کە بەشێکی زۆریان لە بنجدا خەڵکی کوردستانی عێراق بوون و لەدوای ساڵی ١٩٤٨ ڕوویانکردە دەوڵەتی ئیسرائیل.

* بەشی مێژوو،کۆلێژی ئاداب،زانکۆی سەلاحەدین-هەولێر
**وەزارەتی کاروباری شەهیدان و ئەنفالکراوەکان
qaraman.rahman@su.edu.krd
nawsherwansaeed@gmail.com.

وەرگرتن 2023/11/06
پەسندکردن 2023/12/24
بڵاوکردنەوە 2024/04/15

وشە سەرەکییەکان:
عێراق،
پرس،
کورد ئیسرائیل،
ڕۆژنامەی داڤار.

**About the Journal**
ZANCO Journal of Humanity Sciences (ZJHS) is an international, multi-disciplinary, peer-reviewed, double-blind and open-access journal that enhances research in all fields of basic and applied sciences through the publication of high-quality articles that describe significant and novel works; and advance knowledge in a diversity of scientific fields.
https://zancojournal.su.edu.krd/index.php/JAHS/about

**1-پێشەكی:**

ڕاگەیاندن و ڕۆژنامەگەریی لە ئیسرائیل ڕۆڵێكی گرنگی هەبووە و تائێستاش بەردەوامە، لەسەر هەردوو ئاستی جەماوەری و دروستكردنی بڕیار، هەروەها بۆ كاریگەری دروستكردن لەسەر ڕای گشتی جیهانیی، تەنانەت ڕۆژنامەگەریی وەك هۆكاری سەرەكی گەیشتن بە ئامانجەكان تێبڕوانراوە. ڕۆژنامەی (داڤار)١، ڕۆژنامەیەكی عیبری ڕۆژانەی ئیسرائیلییە كە لە ساڵی ١٩٢٥ ڕۆژگاری ئینتیدابی بەریتانی لە فەلەستین (١٩٢٠-١٩٤٨) دەستی بە دەرچوون كردووە و تا ساڵی ١٩٩٦ بەردەوامبووە لە دەرچوون.

داڤار ڕۆژنامەی فەرمی ڕۆژانەی سەندیكای كرێكارانی ئیسرائیلی بووە. ڕۆژنامەكە ئاڵای چینی كرێكار بوو لە ئیسرائیل.پیرل كاتسنلسون یەكەمین سەرنووسەری ڕۆژنامەكە بووە و دوای كۆچی سوایی ئەو لە ساڵی ١٩٤٤، زلمان شازار دواتر بووە سێیەمین سەرۆكی ئیسرائیل بووەتە سەرنووسەر و دوای ئەمیش شازار حەنا زمیر ڕزگاربووی هۆلۆكۆست سەرنووسەری بووە. ژمارەیەكی زۆر لە نووسەر و ئەدیب و سیاسەتمەدارانی ئیسرائیل وەك نووسەر و ڕۆژنامەنووس كاریان لە داڤاردا كردووە لە دیارترینیان (شاموئیل یوسف ئاگنون و مۆشێ بەیلینسۆن، هێرزل بێرگەر، هانا زیمەر و دانیال بلۆچ) بوون.

كە سەیری ژمارەكانی داڤار دەكەین، ڕووبەرێكی دیاری لە هەواڵ و زانیارییەكانی تایبەت بە پرسی كورد لە باشووری كوردستان و بزووتنەوە ڕزگاریخوازییەكەی لە قۆناغی سەركردایەتی مەلا مستەفا بارزانی لە شۆڕشی ئەیلول لەخۆ گرتووە. ئەمەش گرنگییەكی مێژوویی گەورەی هەیە، بەهۆی ئەو سەردەمە مێژووییەی كە ڕۆژنامەكەی تێدا دەرچووە و كورد و بزووتنەوەكەی لەو قۆناغەدا گۆڕانكاری گەورەی بەخۆیەوە دیوە لە هەڵكشان و پەیوەندی فرە جەمسەر تا گەیشتن بە ڕێكەوتننامەی ئاداری ١٩٧٠ و دواتریش ڕێكەوتننامەی جەزائیر و نسكۆ و دووبارە سەرهەڵدانەوە، كە دەكرێت وەك زانیاریی مێژوویی لێكۆڵینەوەیان لەسەر بكرێت و سوودیای زۆریان لێوەربگیرێت.

ڕۆژنامەی (داڤار)[1]، بەئامانجی خستنەڕووی دۆزی كورد لەبەشەكانی كوردستان، كاری لەسەر نیشاندانی وێنای بارودۆخی ئەم پێكهاتە نەتەوەییە كردووە، لەم وڵاتانەی تێدا نیشتەجێی بوون، لە نمونەی وڵاتانی وەك توركیا و ئێران و عێراق و سوریا. ڕۆژنامەكە لەم هەوڵەیدا زیاتر تیشكی خستۆتە سەر دۆخی كوردەكانی لە چوارچێوەی عێراق نیشتەجێ بوون، كە لەئەدەبیاتی كورد بە هەرێمی (باشووری كوردستان) و لە سەرچاوە مێژووییە عەرەبی و بیانییەكان بە ناوی (باكووری عێراق) ناسێنراوە، ڕۆژنامەكەش هاوشێوەی دەزگا فەرمییە نێودەوڵەتییەكان، لە بابەتەكانیدا كاتێك ئاماژەی بەو ناوچەیە كردوە، بە هەرێمی باكووری عێراق ناساندویەتی.

ئەم ڕۆژنامەیە لەسەرەتای دەرچوونی وەك ڕۆژنامەیەكی سیاسی ڕۆژانە و تا داخستنی، (٦٢٨) بابەتی جۆراوجۆری لەسەر دۆزی كورد بڵاوكردۆتەوە، لەم نێوەندەشدا لەماوەی نێوان ساڵانی (١٩٧٠- ١٩٧٩) ، ژمارەی بابەتە هاوشێوەكانی، (١٩١) بابەت بووە، كە بەشی زۆریان كەوتۆتە ماوەی توێژینەوەكەمان. بەشێكیان لە شێوەی هەواڵ و ڕیپۆرتاژ و بەشەكەی دیكەیان بەشێوەی وتاری ڕۆژنامەوانی بوون لەلایەن ڕۆژنامەنووسانی جوولەكە یان ڕۆژنامەنووسی ئینگلیز بڵاوكراونەتەوە.

پێكهاتەی توێژینەوە: توێژینەوەكە جگە لە پێشەكی لە سێ تەوەر پێكهاتووە. لەتەوەری یەكەمدا كە بەناونیشانی(پوختەیەكی مێژوویی لەسەر ڕۆڵی (داڤار) لە ناساندنی دۆزی كورد) هاتووە، باس لە دەستپێكی گرنگیدانی ڕۆژنامەكە كراوە بە پرسی كورد بە گشتی لە هەموو بەشەكانی كوردستان. دواتر تەوەرێكی دیكەی تەرخانكراوە بۆ باسكردنی ڕەنگدانەوەی دۆزی كورد لەماوەی چوار ساڵی ئاشتی نێوان سەركردایەتی كورد و حكومەتی عێراقی، بەناونیشانی (ڕێككەوتنی ئاشتی و لێككەوتەكانی لەسەر دۆزی كورد١٩٧٠-١٩٧٤). لەتەوەری سێیەمیشدا، تیشك دەخەینە سەر ڕەنگدانەوەی دۆزی كورد لە هەمان ڕۆژنامە، لە باسێكی تایبەت بەناونیشانی (هەرەسهێنانی ڕێككەوتنی ئاشتی و هەڵگیرسانەوەی شەڕ١٩٧٤-١٩٧٥).

**گرنگی توێژینەوە:** لەم توێژینەوەیەدا مەبەستمانە هەڵسەنگاندنی نێوەندێكی ڕۆشنبیری لە وڵاتێكی نەیار و دژ بە سیاسەتی حوكمڕانە عەرەبییەكان بەرامبەر پێكهاتە نەتەوەییەكانی لە وڵاتەكانیان نیشتەجێ بوون بخەینەڕوو. وەك نێوەندێكی كاریگەر، لە ململانێی سیاسی سەركردایەتی كورد و دەسەڵاتدارانی بەغدا لە ماوەی لێكۆڵینەوەكەدا.

ئامانجی توێژینەوە: تێگەیشتنە لە ڕادەی بەدەنگەوەهاتنی بانگەوازەكانی خەڵك و سەركردایەتی سیاسی كورد، لەپێناو خستنەڕووی دۆزی كورد لەبەردەم كۆمەڵگەی نێودەوڵەتی، لەلایەن یەكێك لە ڕۆژنامە دیار و بەناوبانگەكانی ئیسرائیل.

میتۆدی توێژینەوە: لەڕێگەی هەڵسەنگاندنی بابەتیانەی هەواڵە ڕۆژنامەوانییەكان، بە شێوازی ساڵبەندی ڕووداوەكانمان پۆلێن كردووە بۆ سەر چەند قۆناغێكی مێژوویی. لەگەڵیدا هەوڵئەدەین بابەتەكانی تایبەت بەو پرسە، شەنوكەوبكەین بەپیادەكردنی ڕێبازی شیكاری لە ئامادەكردنی لێكۆڵینەوەكەدا.

سنووری توێژینەوە: لە ڕووی زەمەنییەوە، توێژینەوەکە لەگەڵ ڕێککەوتنامەی (ئاداری١٩٧٠) دەست پێدەکات و لەگەڵ نسکۆی شۆڕشی کورد لە (نیسانی١٩٧٥) کۆتایی دێت. لەڕووی جوگرافیشەوە، لە بەشێکی پێشهاتە سیاسییەکانی عێراقی کۆڵیوەتەوە، بەتایبەتی ئەو بابەتانەی پەیوەندییان بە دۆزی کورد هەبووە لەم وڵاتەدا.

سەرچاوە سوودبەخشەکانی توێژینەوە: بەشێوەیەکی سەرەکی بریتیین لەم بابەت و هەواڵە ڕۆژنامەوانیانە لە ڕۆژنامەی (داڤار)، لە دوای ڕێککەوتنامەی ئاداری(١٩٧٠) بڵاوکراونەتەوە. کە بەدڵنیاییەوە بەگشتی لەڕیزبەندی پێشەوەی سەرچاوە ڕەسەنەکانن، لە ئامادەکردنی توێژینەوەیەکی زانستی.

## 2- پوختەیەکی مێژوویی لەسەر ڕۆڵی (داڤار) لە ناساندنی دۆزی کورد:

ڕۆژنامەگەری جیهانی بەشێوەیەکی گشتی، ڕۆڵی گرنگ و بەبایەخی هەبووە لە ناساندن و ئاشناکردنی بزاڤی ڕزگاریخوازی نەتەوەیی کورد و ئامانجەکانی بۆ بەدیهێنانی مافە نەتەوەییەکانی گەلی کورد، بە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی. یەکێک لەم ڕۆژنامە جیهانیانەش کە بەزمانی عیبریی( لە ساڵی ١٩٢٥ تا ساڵی ١٩٩٦)، بەشێکی بەرچاوی ژمارەکانی خۆی بۆ خستنەڕووی دۆزی کورد تەرخانکردووە لەسەر لاپەڕەکانی، ڕۆژنامەی (داڤار)ی ئیسرائیلی بووە.

ڕۆژنامەی داڤاری ئیسرائیلی، لەسەر لاپەڕەی یەکەمیدا بە نووسینی عەرەبی بەناوی(دابار) و بەنووسینە عیبرییەکەی بەناوی(داڤار) هاتووە، بڵاوکراوەیەکی ڕۆژانەی سەندیکای کرێکارانی ئیسرائیل[٢] بووە. (٢١) هەزار ژمارەی لە ماوەی نێوان (١ی حوزەیرانی١٩٢٥) تا (٢١ی ئایاری١٩٩٦) بڵاوکراوەتەوە. دامەزرێنەری ڕۆژنامەکە دوو ڕۆشنبیری جوولەکە بوون، کە یەکەمیان (بیریل کاتسنلسون)[٣] و ئەوەی دیکەیان موشیە شاریت(١٨٩٤-١٩٦٥)بوو(נאור,2015).

پارتی (هستدروت) لە کۆنگرەی(١٠)یەمی خۆیدا لە ساڵی (١٩٢٥)، بەبڕیارێک(کاتسنلسون)ی بەسەرنووسەری ڕۆژنامەکە دامەزراند. ناوبراو تا ساڵی ١٩٤٤ کاروباری ئەم ڕۆژنامەیەی بەڕێوەبردووە. لەو ماوەیدا هەوڵیداوە ڕۆژنامەکە وەک ئامرازێک بۆ خزمەتکردنی جوڵانەوەی کرێکاران و گەشەپێدانی ئایدۆلۆژیای ئیشتراکی و نیشتمانی بەکاربێنێ(שפירא،1977،עמ'.243-246). پاشان لە (تەمموزی١٩٧٠) ڕۆژنامەنووس و نووسەری دیاری جوولەکە حنا زمیر(١٩٧٠-١٩٩٠) کاروباری ڕۆژنامەکە بەڕێوەبردووە. لەو کاتەدا ڕۆژنامەکە لە ڕۆژانی ئاسایی بە(٤) لاپەڕە و لە ڕۆژی پشووی هەفتەکە، بە (٦) لاپەڕە بڵاوکراوەتەوە. بەشێوەیەکی گشتی بۆ بەدەستهێنانی داهاتیش، پشتی بە قازانجی فرۆشتن بەستووە، کە بەپێی زانیاری ڕۆژنامەکە خۆی، زۆرترین ژمارەی هاوبەشیکەرانی لە ساڵی (١٩٧٠) گەیشتۆتە (٢٠) هەزار هاوبەش(נאור,2015).

بەدرێژایی تەمەنی کاری ڕۆژنامەوانی، ڕۆژنامەکە بە بایەخەوە سەیری دۆزی کوردی کردووە لە هەموو بەشەکانی کوردستان، هەواڵ و بابەتی جۆراوجۆری لەسەر پرسی کورد لەم وڵاتانەی نەتەوەی کوردی تێدا نیشتەجێن، وەک پێکهاتەیەکی نەتەوەیی جیاواز لەگەل پێکهاتە سەرەکییەکانی دەسەڵاتی حوکمڕانی وڵاتەکانی وەک تورکیا و عێراق و سوریا و ئێرانیان لەژێر دەست بووە، لە نمونەی تورک و فارس و عەرەب. کاری لەسەر داخوازی و داواکارییەکانی ئەم پێکهاتە نەتەوەییە کردوە، لە چوارچێوەی گرنگیدانی بە مافی گەلانی ژێر دەسەتە، لەناوچە جیاوازەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەراست. لەسەرەتاشدا نۆبەرەی بابەتە ڕۆژنامەوانییەکانی لەسەر دۆزی کورد بڵاویکردۆتەوە، باسی لە (کێشەی موسڵ)[٤] کردوە و ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە لەم ویلایەتە، بەنزیکەی (نیو)ملیۆن کورد دەژین، پێویستە گوێ لە خواستەکانیان بگیرێ و هیچ ڕەوا نیە حکومەتی تورکیا ڕاپەرینی کورد سەرکوت دەکات، کوردەکان بەو هۆیەوە ڕەنگە بچنە پاڵ عێراق، بۆ دیاریکردنی چارەنووسی خۆیان(דבר،25 דצמבר 1925، עמ'.2). ڕۆژنامەکە بەم هەواڵە سیاسییە لەسەر بارودۆخی کوردەکان دەستیپێکرد و دواتریش لەسەر ئەم ئاڕاستەیە بەردەوام بوو، لەم ڕێگەیەشەوە زۆربەی ئەم ڕووداوانەی لەم ماوە مێژووییەدا ڕووبەڕووی لەباشووری کوردستان بویەوە، بوونە هەواڵی گەرمی ڕۆژنامەکە، بە نمونەی ڕاپەرینی شێخ مەحمودی حەفید لە(١٩٣٠) سلێمانی[٥]، و ڕاپەڕینەکانی یەکەم و دووەمی بارزان بە ڕێبەرایەتی شێخ ئەحمەد بارزانی لە(١٩٣٠-١٩٣٢)[٦] (דבר، 1 אַפּרִיל 1932، עמ'.2) ، و مەلا مستەفا بارزانی (١٩٤٣-١٩٤٥)[٧](דבר، 19 אַפּרִיל 1946، עמ'.2)، وێڕای نیشاندانی وێنای ڕاستەقینەی دامەزراندنی کۆماری کوردستان و هۆکارەکانی ڕووخانی ئەم قەوارە کوردییە لە ماوەی نێوان (کانونی دووەمی١٩٤٦- کانونی یەکەمی١٩٤٦)[٨](דבר، 3 יוני 1946، עמ'.1).پاشان چەند هەواڵێکی ئەگەر بەڕادەیەکی کەمیش بێت لەسەر ئاوارەبوونی بارزانییەکان بە ڕێبەرایەتی مەلا مستەفا بارزانی لە سۆڤیەت[٩]، لەماوەی نێوان ساڵانی (١٩٤٧-١٩٥٨) خستۆتەڕوو דבר، 12 אוֹקְטוֹבֶּר 1948، עמ'.1) ، تاوەکو ساتی گەڕانەوەی بارزانی لە تشرینی یەکەمی ١٩٥٨ بۆ عێراق[١٠]، دوای دەرچوونی بڕیاری لێخۆشبوونی لەلایەن حکومەتی عێراق[١١](דבר،15 אוגוסט 1958، עמ'.27). سەرباری خستنەڕووی هەموو ئەو پێشهاتە سیاسیانەی

لە عێراق ڕوویانداوە لە ماوەی نێوان ساڵانی ١٩٥٨ تا ١٩٦١، کە وەک فاکتەرێکی ڕاستەوخۆی نیشانداوە بۆ هەڵگیرسانی شۆڕشی کورد لە (ئەیلولی ١٩٦١)[١٢](דבר،17 ספטמבר 1961، עמ'.1).

دوای هەڵگیرسانی شۆڕشی کورد لە باشووری کوردستان، ڕۆژنامەکە پانتاییەکی فراوانتری بۆ بڵاوکردنەوەی ڕووداوەکانی شەڕ و دانوستان و ئاگربەستەکانی نێوان سەرکردایەتی سیاسی بزاڤی ڕزگاریخوازی کورد و حکومەتی عێراقی تەرخانکرد(דבר،2/1/1962،עמ'.1)، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی بەدرێژایی ماوەی شۆڕشی کورد تا ڕێککەوتننامەی ئاداری١٩٧٠(דבר،12/3/1970،עמ'.1)، ڕۆژنامەکە ڕۆڵی لایەنگیریی بینیوە بەرامبەر شۆڕشگێرانی کورد و ئامانجەکانیان. تەنانەت هەمیشە مەلا مستەفا بارزانی بە ڕێبەری کورد ناساندووە، لەسەر ئەم بنەمایە دەکرێ بڵێین هاوسۆزی و پشتیوانی ڕۆژنامەکە بۆ کورد، بە ئاشکرایی هەستی پێدەکرێ لە تەواوی بابەتەکانی بڵاویکردۆتەوە. بۆیە هەوڵەدەین لەتەوەرەکانی داهاتوو وردکارییەکانی تایبەت بەو هەواڵ و ڕیپۆرتاژە ڕۆژنامەوانیانە بخەینەڕوو، کە لەژمارە جیاوازەکانی ڕۆژنامەی داڤار لەماوەی نێوان ساڵانی (١٩٧٠-١٩٧٥) لەسەر پرسی کورد باسیان لێیەوە کراوە.

### 3. ڕێککەوتنی ئاشتی و لێککەوتەکانی لەسەر دۆزی کورد(١٩٧٠-١٩٧٤)

لەماوەی نێوان ساڵانی (١٩٧٠- ١٩٧٩)، ڕۆژنامەی داڤار، (١٩١) بابەتی جۆراوجۆری لەسەر دۆزی کورد بڵاوکردۆتەوە، زۆرینەی ئەم بابەتانە، دەکەوێتە ماوەی توێژینەوەکەمان. لەم ماوەیەدا لە دەستپێکی بڵاوکراوەکانی لەسەر پرسی کورد بڵاویکردەوە، لە مانەش:

#### 3.1: ڕێککەوتنامەی (١١ی ئاداری ١٩٧٠)

یەکەم بابەتی ئەم ڕۆژنامەیە، دوای ڕێککەوتنی سەرکردایەتی کورد و حکومەتی عێراق لە ئاداری ١٩٧٠، بەناوونیشانی ( ڕێککەوتنی ئاشتی لەنێوان بەغدا و کوردەکان واژووکرا) لە نووسینی (ئیهود یعاری) بڵاوکراوەتەوە. ئەم ڕۆژنامەنووسە لەم بابەتەدا کە لە (١٢ی ئاداری١٩٧٠) بڵاویکردۆتەوە، باس لە وردکارییەکانی ڕێککەوتنی مێژوویی سەرکردایەتی سیاسی کورد کردوە، کە لە (١١ی ئاداری١٩٧٠)[١٣] لەگەڵ حکومەتی عێراق ئەنجامیدا و لەم بارەوە نووسیویەتی:" دوێنی لەبەغدا ڕێککەوتنی ئاشتی لەنێوان دەسەڵاتدارانی عیراق و جەنگاوەرە کوردەکان بە ڕێبەرایەتی مەلا مستەفا بارزانی واژووکرا. ڕێککەوتنەکە ئۆتۆنۆمی بۆ کوردەکان مسۆگەر دەکات، لەناوچەکانی باکووری عێراق، کە تیایدا کوردەکان زۆرینەی دانیشتوانەکانی پێکدەهێنن، بەڵام ئەوەی تا ئێستا ڕوون نییە، نازانرێ تایبەتمەندییەکانی ئەم ئۆتۆنۆمییە نوێیە چییە... بێگومان ئەم ڕێککەوتنە فشارەکانی سەر حکومەتی بەعس لە بەغدا کەم دەکاتەوە، کە لەم چەند ساڵەی دوایی زۆر لاواز بووە. سەرباری ئەوەی بۆ کوردەکان، هۆکارێک بوو بۆ فەرامۆشکردنی ئەو سەرکردە کوردانەی دژایەتی بارزانیان دەکرد و لەپاڵ حکومەتی عێراقی، فشارییان لەسەر شۆڕشی کورد دروستکردبوو. لە ڕێککەوتنەکەدا بارزانی بەفەرمی لەلایەن حکومەتی عێراق وەک ڕێبەری پارتی دیموکراتی کوردستان دانی پێدانرا و پارتەکەش وەک پارتێکی سیاسی شەرعی لەپاڵ حزبی بەعسی حوکمڕان سەیر دەکرێ. بەپێی ڕێککەوتنەکە وەک ڕۆژنامەکە ئاماژەی پێکردووە، هەموو چەکە قورسەکانی دەستی جەنگاوەرە کوردەکان ڕادەستی حکومەتی عێراق دەکرێنەوە، لە کۆتایی جێبەجێکردنی ڕێکارەکانی پەیوەندیدار بە ڕێککەوتنەکە. هەروەها لێخۆشبوون بۆ هەموو ئەوانە دەردەکرێ کە پشتیوانی مەلا مستەفا بارزانیان کردووە. سەرباری ئەمەش ئەفسەرە کوردەکان دەگێردرێنەوە بۆ سەر کارەکانی خۆیان و پۆستی باڵایان پێ دەدرێ لەنێو پێکهاتەی سوپای عیراقی و لە دەسەڵات و حکومەتی عێراقی بەشداردەبن و دەسەڵات زمانی کوردی وەک زمانێکی فەرمی لەپاڵ زمانی عەرەبی لە عێراقدا دەناسێنێ(דבר،12/3/1970،עמ'.1). لەدرێژەی خستنەڕووی وردکارییەکانی تایبەت بە ڕێککەوتنەکە، ڕۆژنامەی (داڤار) لە (١٥ی ئاداری١٩٧٠) بەشێکی گوتاری جێگری سەرۆک وەزیرانی عێراقی لە کۆنفرانسێکی ڕۆژنامەوانی بەناونیشانی ( ڕێککەوتنەکە خێراتر لە پێشبینی کوردەکان جێبەجێ دەکرێ) بڵاوکردەوە، کە تیایدا بەرپرسە عێراقییەکە ئاماژەی بۆ ئەوە کرد، کە هێزە چەکدارەکانی بارزانی هەڵنەوەشاونەتەوە، بەگوێرەی ئەو ڕێککەوتنەی ئەنجامدراوە تاوەکو هەموو ڕێکارەکانی جێبەجێکردنی ڕێککەوتنەکە تەواونەبن، ئەم هێزانە وەک خۆیان دەمێننەوە. جگە لەمەش باسی لەوە کرد کە ڕێککەوتنەکە لە (١٥) ماددەی پێکهاتووە. لەچوارچێوەی ماددەکانی ئەم ڕێککەوتنە،دواتر گفتوگۆ دەکەین لەسەر دیاریکردنی نەخشەی ناوچەی ئۆتۆنۆمی بۆ دیاریکردنی هەموو ئەو ناوچانەی کە زۆرینەی دانیشتوانی کوردن، تا بخرێنە نێو چوارچێوەی ناوچەی ئۆتۆنۆمی. هەروەها ئەنجومەنێکی نیشتمانی بڕیاری لەسەر دراوە دابمەزرێ و ژمارەیەک لە نوێنەرانی کورد لە باکوور تێیدا بەشداربن، سەرباری بەشداریکردنی کوردەکان لە حکومەتی بەغدا و جێبەجێکردنی یاسای چاکسازی کشتوکاڵی لەناوچە کوردییەکان. دیارە هەر لەم بابەتەدا، ڕۆژنامەکە پوختەیەکی کورتی لە دیداری مەلا مستەفا بازرانی لەگەڵ ئاژانسی هەواڵی عێراقی بڵاوکردۆتەوە و لەم دیدارەدا بارزانی ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، کە سەرکردایەتی کورد هیچ نیازێکی بۆ جیابوونەوە لە عێراقدا نییە و پێشوازی لە ڕێککەوتنەکەی نێوان حکومەتی عێراق و سەرکردایەتی کورد کرد. هەروەها ڕایگەیاند کە حکومەتی عێراق دەتوانێ بەهۆی ئەم ڕێککەوتنە ڕۆڵێکی

کاریگەرتر ببینێ، لە خەباتی عەرەب لەدژی ئیسرائیل(דבר،15/3/1970،עמ'.2). دیارە ئەم ڕێککەوتنە هەرچەندە هەموو مافە نەتەوەییەکانی گەلی کوردی بە شێوەیەکی گشتی لە خۆنەگرتبوو، بەڵام پێشەوەچوونێکی گرنگ و بایەخداربوو لە پرسی کورد لە عێراقدا، لەبەرئەوەی دوای دامەزراندنی ئەم دەوڵەتە، ئەم ڕێککەوتنامەیە بەشێوەیەکی فەرمی ، دانی بە ڕەوایەتی مافە نەتەوەییەکانی کورد دانا، لە چوارچێوەی عێراقدا.

لە ڕۆژی دواتر، ڕۆژنامەی (داڤار)، هەر لە چوارچێوەی گرنگیدانی بە ڕێککەوتنامەی (ئاداری ١٩٧٠) ، بابەتێکی دیکەی بەناونیشانی (بارزانی: ڕێککەوتنی نوێ لە پلانی بەزاز باشترە) لەڕۆژی (١٦ی ئاداری١٩٧٠) بڵاوکردەوە، ڕۆژنامەکە لەم بابەتەدا ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، کە ڕێبەری هەڵگەڕاوە کوردەکان مەلا مستەفا بارزانی دەڵێت:" ڕێککەوتنی ئاشتی کە لەگەڵ ڕژێمی بەعس لە (١١ی ئادار) ئەنجامیداوە، باشترە لە پلانی بەزاز کە لە(حوزەیرانی١٩٦٦)[١٤] بۆ چارەسەرکردنی دۆزی کورد لە عێراق ڕایگەیاند. لەبەرئەوەی ئەم ڕێککەوتنە مافی زیاتر بە کورد دەدات لە ئۆتۆنۆمی. هاوکات بارزانی پشتیوانی خۆی بۆ جێبەجێکردنی یاسای چاکسازی کشتوکاڵی لە کوردستان ڕاگەیاند (דבר، 16 /3/ 1970، עמ'.1). لە درێژەی باسەکەیدا و لە هەواڵێکی دیکەی ڕۆژنامەکەدا لە (٣٠ی ئاداری١٩٧٠)دا هاتووە کە (٥) وەزیری کورد بۆ حکومەتی عێراق زیادکران، کە لەلایەن مەلا مستەفا بارزانی دیاریکرابوون. تەنانەت بارزانی پشتیوانی خۆی بۆ جێبەجێکردنی یاسای چاکسازی کشتوکاڵی لە کوردستان ڕاگەیاند، شیاوی باسە وەزیرە کوردەکانی لە حکومەتی عێراق بەشداربوون دوای پێکهێنانی لە(٢٩ی ئاداری ١٩٧٠) پێکهاتبوون لە (لە نافز جەلال( وەزیری کشتوکاڵ) و نوری سەدیق شاویس (وەزیری ئەشغال و نیشتەجێکردن) و ئیحسان شێرزاد (وەزیری شارەوانی) و ساڵح یوسفی (وەزیری دەوڵەت) و سامی عەبدوڕەحمان (وەزیری ئاوەدانکردنەوەی باکوور) (דבר، 30 /3/ 1970، עמ'.1).

دوای ئەنجامدانی ڕێککەوتن لەگەڵ سەرکردایەتی سیاسی کورد، حکومەتی بەعس، بڕیاریدا هێزی سەربازی زیادە ڕەوانەی بەرەی شەڕ بکات لەگەڵ ئیسرائیل. لەسەر ئەم بنەمایە وەک ڕۆژنامەی (داڤار) لە بابەتێکدا بەناونیشانی (هێزی زیادەی عێراقی بۆ بەرەی ئیسرائیل) کە لەڕۆژی (٢٠ی نیسانی١٩٧٠) بڵاوکراوەتەوە، ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە دەسەڵاتدارانی بەغدا لە (١٩ی نیسان) بڕیاریاندا هێزی زیادەی سەربازی ڕەوانەی بەرەی ڕۆژهەڵات بکەن لەدژی ئیسرائیل. ئەوە لە کاتێکدا وەک ڕۆژنامەکە باسیکردووە، جارێکی دیکە دوای ماوەیەکی کورت لە ڕێکەوتنی ئاداری١٩٧٠ی نێوان کورد و حکومەتی عێراق، خەریکە ئاشتی نێوانیان بەرەو دۆخێکی نادیار دەچێ، ئەم پێشبینییەی ڕۆژنامەکە پشتی بە تێڕوانینی یەکێک لە سەرکردەکانی کورد بەست کە (مەحمود عوسمان) بوو. ئەم ژێدەرە باسی لەوە کرد، کە ئەگەری جێبەجێکردنی ڕێککەوتنەکە لاوازە. بڕیار وایە حکومەتی عێراقی لە کۆتایی ساڵ سەرژمێری دانیشتوان ئەنجام بدات و پاشان ناوچەکانی زۆرینەی دانیشتوانەکەی کوردە، لە چوارچێوەی یەکەیەکی کارگێری یەکبخرێ، بەم شێوەیە کوردەکان دەبنە خاوەنی ناوچەیەکی ئۆتۆنۆمی(דבר،20 אפריל1970، עמ'.2). بەڵام وردتر لەم زانیارییانەی هەبوون لەسەر ئاستەنگەکانی بەردەم ڕێکارەکانی جێبەجێکردنی ڕێککەوتنامەی ئاداری١٩٧٠، پرسی کەرکوک بوو، وەک ڕۆژنامەکە لە ژمارەی (٢٣ی تەمموزی١٩٧٠) بە ناونیشانێکی درشت بڵاویکردۆتەوە(کەرکوک کلیلەکەیە). لە سەرەتای ئەم باسەدا ڕۆژنامەکە نووسیویەتی:" ئاستەنگ هەیە لە ڕێگەی جێبەجێکردنی ڕێککەوتنی نێوان بەغدا و کوردەکان). لە وردکاری ئەم بابەتەدا ڕۆژنامەکە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، زیاتر لە سێ قۆناغ تێپەڕیوە لەدوای گەیشتن بە ڕێککەوتنی نێوان کوردەکان و عێراقییەکان، بەڵام لەپێناو پراکتیزەکردنی ڕێککەوتنەکە بۆ بەدیهێنانی چارەسەری بەردەوام، لەسەر هەردوو لایەن پێویستە زاڵبن بەسەر ئاستەنگە گەورەکە، کێ کەرکوک بەڕێوە دەبات؟ کە زۆرینەی نەوتی وڵاتی تێدایە، کوردستانێکی سەربەخۆی نوێ؟ یان حکومەتی ناوەندی لە بەغدا؟ کێشەکە چارەسەر دەکرێ لە ڕێگەی سەرژمێری دانیشتوان، کە لەپایز ئەنجام ئەدرێ، کوردەکان بانگەشەی ئەوە دەکەن کەرکوک خاکی ئەوانە لە ڕووی مێژوویی و جوگرافییەوە، هەردوو لایەن پێداگری دەکەن لەسەر ناوچەکە، سەرباری ڕێککەوتنی (١١ی ئاداری١٩٧٠). بەپێی ئەو ڕێککەوتنە، سوود لە داهاتە سروشتییەکان وەردەگیرێ لەمانەش نەوت لەلایەن حکومەتی ناوەندی. مەلا مستەفا بارزانی ڕێبەری کورد، هەڵوێستێکی توندی هەیە لەم بارەیەوە، دیارە کوردەکان لە دەوری بارزانی کۆبوونەتەوە، لەبەرئەوەی وەک لایەنی براوەی شەڕ سەیر دەکرێ(דבר،23 יולי1970، עמ'.9). دواتر بەپێی زانیارییەکانی ڕۆژنامەی داڤار، ئاڵۆزییەکان دەگەنە ئەو ڕادەیەی ڕۆژنامەی (التاخی)ی زمانحاڵی پارتی دیموکراتی کوردستان، هێرشی توند بکاتە سەر حکومەتی عێراق و بەخۆدزینەوە لە جێبەجێکردنی ڕێککەوتنامەکە تۆمەتباری بکات (דבר،8 ספטמבר1970، עמ'.8).

### 3.2: هەوڵی تیرۆرکردنی ئیدریس بارزانی

دۆخی ئاشتی و سەقامگیری سیاسی و لەیەکتری نزیکبوونەوەی سەرکردایەتی سیاسی کورد و دەسەڵاتدارانی بەغدا زۆر درێژەی نەکێشا، تا ئەو ڕادەیەی حکومەتی عێراقی، دەستیکرد بە پیلانگێری لە دژی سەرکردە کوردەکان، لەیەکەم هەوڵیشیاندا لە شەوی (٧/٦ی کانونی یەکەمی ١٩٧٠) لەبەردەم هۆتێلی ئۆپێرا لە شاری بەغدا کاتژمێر (١٢)ی شەو، تەقەیان لە ئۆتۆمۆبێلی ئیدریس

بارزانی(١٩٤٤-١٩٨٧)کرد، بە ئامانجی تیرۆرکردنی(محمد،٢٠١٩، ل١٦٧). لەم سۆنگەوە رۆژنامەی (داڤار) لەپێناو خستەنەڕووی هەڵوێستی مەلا مستەفا لەسەر ئەم ڕووداوە، بابەتێکی لە (٢٣ی کانونی یەکەمی١٩٧٠) بەناونیشانی (مەلا مستەفا بارزانی داوای لێکۆڵینەوە دەکات) بڵاوکردەوە و لەنێوەڕۆکی باسەکەدا، ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە ڕێبەری خەباتگێرانی کورد، داوای لە دەسەڵاتدارانی عێراق کردووە ژمارە و ناونیشانی هەموو ئەوانە ئاشکرا بکات کە دەستیان لە هەوڵی تیرۆرکردنی ئیدریس بارزانی هەبووە. بەپێی زانیاری رۆژنامەکە بارزانی بۆ یەکێک لە رۆژنامە جیهانییەکان باسی لەوە کردوە، کە ئەم کردەیە دەبێتە هۆی هەڵوەشاندنەوەی ڕێککەوتنامەی (١١ی ئادار)، لە کاتێکدا ئەم ڕێککەوتنە سنوورێکی دانا بۆ شەڕی ناوەخۆیی،کە ماوەی (١٠) ساڵان بەردەوام بوو لە عێراق(דבר،23 דֶּצֶמְבֶּר1970، עמ'.3).

سەرباری ئەم دۆخە ئاڵۆزەی هەبوو لە پەیوەندی نێوان کورد و حکومەتی عێراق، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەنگاوەکانی جێبەجێکردنی ڕێککەوتنامەکە ئەگەر لەسەرخۆش بوو بەردەوام بوو، بەشێوەیەک وەک ساڵح یوسفی(١٩١٨-١٩٨١) ئەندامی سەرکردایەتی پارتی دیموکراتی کوردستان و وەزیر لە حکومەتی عیراقی بە دەزگاکانی ڕاگەیاندنی عێراقی گەیاند، دەوڵەت لەسەروبەندی دامەزراندنی ئەنجومەنی نیشتمانی دایە کە (١٠٠) ئەندامی دەبێت و کوردیش بەپێی ڕێژەی دانیشتوانی لەم وڵاتە، (٢٠-٢٥) نوێنەری لە ئەنجومەنەکەدا دەبێت، بەپێی ئەوەی لە ڕێککەوتنامەی ئادار بڕیاری لەسەر دراوە(דבר،26מֵרץ1971، עמ'.2).

### 3.3: کاودانی دیاربەکر:

ئەو سەرکەوتنە سیاسی و سەربازییانەی کوردانی عێراق بەدەستیان هێنا و دەسەڵاتادارانی بەغدای ناچار بە ڕێککەوتن و سازان کرد لەگەڵ سەرکردایەتی سیاسی کورد و فاکتەرێکی کاریگەربوو لەسەر بزواندنی هەستی نەتەوەیی کوردەکان لە بەشەکانی دیکەی کوردستان، بەو هۆیەوە وەک رۆژنامەی (داڤار) بڵاویکردۆتەوە، لەسەرەتای مانگی ئایاری (١٩٧١) جارێکی دیکە جموجۆڵی سیاسی کوردەکان لە تورکیا دەستی پێکردەوە و رۆژنامەکە لە ڕێگەی بڵاوکردنەوەی بابەتێک بەناونیشانی (هەستانەوەی کوردی لە تورکیا) ئاماژە بە یارمەتییەکانی بزاڤی ڕزگاریخوازی نەتەوەیی لە عێراق دەکات بۆ براکانیان لە ڕێگەی سنوورەکانەوە. لە وردکاری ئەو باسەدا، کە بابەتێکی درێژە و رووبەرێکی گونجاوی رۆژنامەکەی داگیر کردووە، هاتووە" لە دیاربەکر کە بەنزیکەی (٣-٤) ملیۆن کورد نیشتەجێیە، باس لە سەرهەڵدانی ئاژاوەی توند دەکرێ. زانیارییەکان ئەوە ڕادەگەیەنن، کە پارتێکی کوردی لەم ناوچەیە خەبات دەکات، بۆ سەربەخۆیی کوردستان. سەرچاوەکانی ئاسایشی حکومەتی تورکیا، پێیان وایە پارتی دیموکراتی کوردستان، کە مەلا مستەفا بارزانی ڕێبەری کوردەکانی عێراق سەرکردایەتی دەکات، دەستی هەیە لە هاندانی کوردەکانی دیار بەکر لە دژی حکومەتەکەیان. دوای ئەوەی هێزەکانی ئاسایش، بڕێک چەکی چیکۆسلۆڤاکیان لەنێو حەشارگەیەک لەژێر زەوی و بڕێکی دیکەشیان لەنێو چەند کۆگایەکی نهێنی دۆزیوەتەوە. کە پێشبینی دەکرێت، لە ڕێگەی سنوورەکانەوە، لەلایەن کوردەکانی عێراقەوە گەیشتبێتە دەستی کوردەکانی تورکیا. لە هەرێمێک کە (٦٧) ناوچەی کوردی تێدایە. هەرچەندە حکومەتی عێراقی و هەروەها مەلا مستەفا بارزانی، بێلایەنی خۆیان لە ئاژاوەی ناوچە کوردییەکانی تورکیا ڕاگەیاندووە، بەڵام ئەوەی ڕاستییە، حکومەتی تورکیا لەو پەیامانە دڵنیا نییە، چونکە دوای تێپەربوونی (٤٠) ساڵ بەسەر دوا ڕاپەرینی کوردی ساڵی (١٩٣٠) لە چیاکانی (ئارارات)، ئەوە جارێکی دیکە خواستی جواداخوازی لە نێو کوردەکانی تورکیا سەرهەڵدەداتەوە. دیارە کوردەکانی تورکیا لەدوای هەڵگیرسانی شۆڕشی کورد لە عێراق، یارمەتی زۆریان لە ڕێگەی دابینکردنی چەک و تەمەنی و پارە بە شۆڕشگێرانی کوردی عێراق بەخشی، ئێستاکەش کوردەکانی عێراق وەڵامی براکانیان دەدەنەوە بەهەمان ڕێگە و میکانیزمی ئەوانەی دەستپێشخەربوون، لەهاریکریکردنی خەباتی نەتەوەیی براکانیان لە تورکیا. بەو شێوەیە وا دەردەکەوێ کە جارێکی دیکە خواستە نەتەوەییەکان نامرێ، تەنانەت ئەگەر سەدان ساڵ بەسەریدا تێپەڕێ(דבר،9 מאי1971، עמ'.7).

### 3.4: خستنەڕووی پرسی کەرکوک

دیارە رۆژنامەکە، بارودۆخی ئاڵۆزی سیاسی و گرژبوونی پەیوەندییەکانی حکومەتی عێراق و سەرکردایەتی سیاسی کوردی، لەهەر دۆخێکی دیکە بەبایەختر نیشانداوە و کاری لەسەر کردوە، بۆیە لە میانەی ئەو هەواڵانەی لەسەر لێکەوتەکانی ڕێککەوتنامەی ئاشتی نێوان دەسەڵاتدارانی بەغدا و سەرکردایەتی کورد بڵاوی کردنەوە، بابەتێکی دیکەی لە(٥ی تەمموزی١٩٧١) خستەڕوو، لە نووسینی یەکێک لە نووسەرانی شارەزا لە کاروباری عەرەبی بەناوی(سوفیر دفار) بە ناونیشانی (ڕەنگە کێشە سەر لەنوێ لە نێوان کوردەکان و بەغدا سەرهەڵبداتەوە). نووسەری ئەم بابەتە ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە، کە جوولەپێکردنی هێزە سەربازییەکان بۆ ناوچە کوردییەکان، لە ئاداری ساڵی ڕابردوو وەستێنراوە، بەڵام لەم ماوەیەدا خەریکە سەرهەڵبداتەوە. وەک نووسەرەکە باسیکردوە، چاودێرانی دۆخەکە، پێیان وایە ئەم دۆخە ئەگەری سەرهەڵدانەوەی شەڕی بەهێزە. لەم سۆنگەوە مەلا مستەفا بارزانی، نامەیەکی ئاڕاستەی سەرۆکی عێراق ئەحمەد حەسەن بەکر(١٩٦٨-١٩٧٩) کردووە. لەم نامەیەدا بارزانی سکاڵای کردووە لە خۆدزینەوەی

حکومەتی عێراقی لە جێبەجێکردنی ئەو برگانەی لە ڕێککەوتنامەی ئاداری١٩٧٠ سەبارەت بەدیاریکردنی سنووری ناوچەی ئۆتۆنۆمی. سەرباری ئەوەی بارزانی لە نامەکەیدا باس لە بەردەوامبوونی پرۆسەی بەعەرەبکردنی ناوچە کوردییەکانی دەوڵەمەندبوون بە نەوت دەکات، بە ئامانجی گۆڕینی دیمۆگرافیای ناوچەکە لەبەرژەوەندی عەرەبە هاوردەکان. بەڵام وەڵامی سەرۆک(بەکر) هیچ دۆستانە نەبوو، بەڵکو بە زمانی هەڕەشە باسی لە ئەگەری دەستپێکردنەوەی پرۆسە سەربازییەکان کرد لە دژی کورد و تۆمەتەکانی بارزانی ڕەتکردەوە. بەو هۆیەوە مەلا مستەفا بارزانی بۆ خۆئامادەکردن بۆ هەر ئەگەرێکی سەربازی چاوەڕوانکراو بۆ سەرکردایەتی سیاسی کورد، بانگهێشتی کۆبوونەوەی ئەنجومەنی سەرکردایەتی پارتی دیموکراتی کوردستانی کرد، بە بەشداری تەواوی وەزیرە کوردەکانی ئەندامی ئەنجومەنی وەزیرانی حکومەتی عێراقی بوون. بەڵام دوای کۆبوونەوەکە، هیچ زانیارییەک دەست نەکەوتووە لەسەر ئەو بڕیارانەی لە کۆبوونەوەکە دەرچوون(דבר،5 יולי1971، עמ'.1).

سەرپێچیکردنی برگە و ماددەکانی ڕێککەوتنی ئاداری١٩٧٠، جەنگاوەرانی کورد و سەربازانی سوپای عێراقی جارێکی دیکە ڕووبەڕووی یەکتری کردنەوە، وەک لە زانیارییەکانی یەکێک لە پەیامنێرانی ڕۆژنامەی (براڤدا) بەناوی (جاک موری) لە پاریسی پایتەختی فەرەنسادا هاتووە، کە لەتۆی بابەتێکدا کە لە(٢١ی تەمموزی١٩٧١) بەناونیشانی (شەڕێکی سەخت ڕوودەدات لە نێوان کوردەکان و سوپا لە باکوری عێراق) خستیەڕوو. لەم هەوڵەدا پەیامنێرەکە بە پشت بەستن بە سەرچاوە باوەڕپێکراوەکانیان لە (بەیروت)ی پایتەختی لوبنان، باس لەوە دەکات کە:" شەڕێکی سەخت لەم دواییانە لە باکووری عیراق ڕوویداوە و بەهۆی دەستێوەردانی حکومەتی عێراقی لە کاروباری یەکە کارگێرییەکانی کەوتونەتە ناوچە کوردییەکان، کە دوای ڕێککەوتنی ئادار، کوردەکان خۆیان پێکیان هێناوە. بەو هۆیەوە شەڕێک کە ماوەی (٢) ڕۆژی خایاند، لە نێوان جەنگاوەرانی کورد و سەربازانی سوپای عێراقی دروستبوو، تیایدا سەرباری ئەوەی سوپای عیراقی هێزی پێنجەمی (زرێپۆش) و کەتیبەی(٣)ی پیادەی لیوای(١٨) و یەکەی تۆپخانەی دوورهاوێژی (٣٧) فەیلەقی چیاکان بەشداری پێکردوە لەشەڕەکەدا، کەچی شکستیان هێناوە. بەڵام دوای شەڕەکە، مەلا مستەفای بارزانی بۆ ئاساییکردنەوەی دۆخەکە، بەبۆنەی ڕۆژی نیشتمانی عێراق، لە ڕۆژەکانی (١٤، ١٧ی تەمموز) نامەی پیرۆزبایی بۆ سەرۆکی عێراق (ئەحمەد حەسەن بەکر) ڕەوانە کرد، بە ئامانجی ڕێگریکردن لە سەرهەڵدانەوەی شەڕ و ئاڵۆزتربوونی بارودۆخەکە لەوەی کە هەبوو(דבר،21 יולי1971، עמ'.2). لە ئەنجامی هاتنەپێشەوەی ئەم دۆخە، ڕۆژنامەکە لە بابەتێکی دیکەیدا کە لە(٣٠ی ئابی١٩٧١) بە ناونیشانی ( بانگهێشتکردن بۆ دامەزراندی بەرەی نیشتمانی لە عێراق، کوردەکان و شیوعییەکان لەخۆبگرێ) بڵاوکردەوە، ڕۆژنامەکە لەم بابەتەدا باسی لەوە کرد کە:" سەرباری ئەوەی (٥) وەزیری کورد بەشدارن لە حکومەتی بەغدا، بەڵام تا ئێستاکە، جێگرێکی کورد بۆ سەرۆکی عێراق دیارینەکراوە و هیچ کوردێک لەوانەی بەزۆرەملێ لەسەر زێدی خۆیان لەناوچەی کەرکوکی دەوڵەمەند بە نەوت ڕاگوێزراون، نەگەڕێنراونەتەوە بۆ ناوچەکانی خۆیان، لەپێناو ئەنجامدانی سەرژمێری بۆ دیاریکردنی سنووری ناوچەی ئۆتۆنۆمی. لەبەرئەوەی حکومەتی عێراقی مەبەستیەتی ئەو ناوچەیە لەژێر دەسەڵاتی بەغدا بمێنێتەوە و نەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی کارگێری نێوخۆیی کوردەکان خۆیان. تەنانەت کوردەکان مەبەستیان نیە بەشداری ئەو بەرەیە بکەن، کە حکومەتی بەعس بەناوی (بەرەی نیشتمانی) مەبەستیەتی بە بەشداری پارتی دیموکراتی کوردستان و حزبی شیوعی عیراقی، لەگەڵ حزبی بەعس دایبمەزرێنێ(דבר،30 אוגוסט1971، עמ'.7).

### 3.5: هەوڵی تیرۆرکردنی مەلا مستەفا بارزانی

سەرباری ئەم دۆخە چەقبەستووەی لەنێوان دەسەڵاتدارانی بەغدا و سەرکردایەتی کورد هەبوو، کەچی دەسەڵاتدارانی بەغدا، دوو دڵ نەبوون بە ئەنجامدانی تاوانکاری تیرۆریستی کۆتایی بە ڕێککەوتنی ئاداری١٩٧٠ بهێنن لەڕێگەی هەوڵدان بۆ تیرۆرکردنی مەلا مستەفا بارزانی، کاتێک هەوڵەکە شکستی هێنا، چوونەوە لای بارزانی بۆ نیشاندانی ئەستۆپاکیان لەم ڕووداوە، ئەم ڕووداوە لە ڕۆژنامەی (داڤار) ئاماژەی پێنەکراوە، ئەوەندە نەبێت لە بابەتێکدا بەناونیشانی(بەغدا شاندی ئاشتی دەنێرێتە لای بارزانی) لە ژمارەی (٣ی تشرینی یەکەمی١٩٧١)ی ڕۆژنامەی داڤار هاتووە کە:" دوێنی حکومەتی عێراقی شاندێکی ڕەوانەی باکووری عێراق کردووە بۆ ڕازییکردنی ڕێبەری کورد مەلا مستەفا بارزانی بۆ ئاساییکردنەوەی پەیوەندییەکانیان، کە بەهۆی گومانەکانی بارزانی لەوەی دەسەڵات دەستی هەبووە لەئەنجامدانی هەوڵێکی شکستخواردوو بۆ تیرۆرکردنی. بەو هۆیەوە جێگری وەزیری ناوەخۆ دوێنی سەردانی بارزانی کرد بۆ ئەنجامدانی لێکۆڵینەوە لە ڕووداوەکە (דבר،3 אוֹקְטוֹבֶּר1971، עמ'.2).

دوای چەند ڕۆژێک لە بڵاوکردنەوەی هەواڵی سەردانیکردنی شاندی وەزارەتی ناوەخۆی حکومەتی عێراقی بۆ بارەگای بارزانی، ڕۆژنامەکە لێکۆڵینەوەی لەهەوڵە تیرۆریستیە شکستخواردووەکەی ئامانجی کوشتنی مەلا مستەفا بارزانی بوو کرد و لەبابەتێکدا (داڤار) بەناونیشانی (تیرۆرکردنی بارزانی کاری شارەزایانە) لە (٧ی تشرینی یەکەمی١٩٧١) بڵاویکردۆتەوە، کە چەند شارەزایەک لەبەکارهێنانی بۆمب و تەقینەوە، هەوڵی تیرۆرکردنی ڕێبەری کورد مەلا مستەفا بارزانیان ڕێکخستوە. ڕۆژنامەکە وردەکارییەکانی

ئەم ڕووداوەی لەڕۆژنامەی (التاخی) زمانحاڵی پارتی دیموکراتی کوردستان وەرگرتووە، کەتیایدا هاتووە، ڕۆژنامەی (التاخی) کوردی دوێنی نووسیویەتی کە دوو ئۆتۆمۆبێل لە بەغدا وە گەیشتنە بارەگای بارزانی لە ڕۆژی (٢٩ی ئەیلولی١٩٧١)، کە چەند کەسێکی تێدابوو، خۆیان بە پیاوی ئایینی ناساند، ئەم کارە تیرۆریستییەیان ئەنجام داوە(דבר،7אוֹקְטוֹבֶּר1971، עמ'.3).

### 3.6: هەڵوێستی حکومەتی ئێران بەرامبەر پرسی کورد لە عێراق

سەرهەڵدانەوەی گرژی و ئاڵۆزی لە پەیوەندییەکانی نێوان سەرکردایەتی کورد و حکومەتی عێراقی، هاندەربوو بۆ وڵاتێکی دراوسێی عێراق وەک ئێران، بەهۆی پەیوەندی خراپی لەگەڵ بەغدا، لە ڕێگەی دۆزی کوردەوە، دەست بخاتە ناو کاروباری ئەم وڵاتە. ئەمەش لەهەواڵی دیکەی ڕۆژنامەی(داڤار) سەبارەت بەو پرسە لە(٢٢ی کانونی یەکەمی١٩٧١) دا بەناونیشانی (ئێران داوا لە کوردەکان دەکات شەڕ هەڵبگیرسێننەوە) هاتووە. لەم هەواڵەدا ڕۆژنامەکە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە ئێستگەکانی ڕادیۆیی ئێران بە شێوەیەکی ئاشکرا و بێ شاردنەوە، بانگەواز بۆ مەلا مستەفا بارزانی دەکەن، شەڕ لەدژی ڕژێمی بەعس لەبەغدا هەڵبگیرسێنێتەوە. لە چوارچێوەی ئەم فشارەدا وەک داڤار نووسیویەتی:" ئەم فشارەی ئێران لەسەر بارزانی، بەو مانایەدێ، مەلا مستەفا بارزانی لە ئێستاوە لە ئەگەری سەرهەڵدانەوەی شەڕ لەگەڵ حکومەتی عێراقی، پاڵپشتی حکومەتی ئێرانی بۆ شۆڕشەکەی مسۆگەر بووە. لە درێژەی باسەکەدا ڕۆژنامەکە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە (ئێستگەی کرمانشا) داوای لە سەرکردە عیراقییەکان کرد، هەماهەنگی بکەن لەگەڵ پارتە سیاسییەکانی ئۆپۆزسیۆن، لەپێناو ڕووخاندنی حکومەتی بەعس و دامەزراندنی ڕژێمێکی دیموکراتی بە ڕێبەرایەتی بەرەی هێزە پێشکەوتنخوازەکان (דבר،22 דֶּצֶמְבֶּר1971، עמ'.1).

بەم شێوەیە ڕۆژنامەی (داڤار) بەردەوام بوو لەسەر خستنەڕووی کێشە و ناکۆکییەکانی نێوان سەرکردایەتی سیاسی کورد و حکومەتی عیراقی، تەنانەت لە (١٤ی ئابی١٩٧٢) ڕۆژنامەکە بابەتێکی بەناونیشانی (هەڕەشەی کوردی لە حکومەتی عێراقی) بڵاوکردەوە، تێیدا هاتبوو:" پارتی دیموکراتی کوردستان، حکومەتی عێراق تۆمەتبار دەکات بە دەرکردنی کوردەکان لەسەر زێدی خۆیان و لە شوێنیاندا، خەڵکی عەرەب هاوردەی ناوچەکە دەکات. سەرەرای ڕووخاندنی گوندەکان بە شۆفەل و ئەنجامدانی هەوڵی تیرۆریستی لەبەرامبەر بارزانی. لە درێژەی نامەکەی مەکتەبی سیاسی پارتیدا هاتبوو، کە دۆخەکە لە تەقینەوەدایە و ڕێککەوتنی ئاشتی ئاداری١٩٧٠ لە مەترسیدایە"(דבר،14 אוגוסט1972، עמ'.1).

دۆزی کورد و وردەکارییەکانی تایبەت بەم بابەتە لە زۆربەی ژمارەکانی ساڵی (١٩٧٢) هاوشێوەی ساڵەکانی دیکەی پێشووتر، ئامادەیی هەبووە. لەهەر جارێکیش ڕۆژنامەکە لە چوارچێوەیەکی جیاوازتر لە بابەتەکانی پێشووتر بڵاوی دەکردنەوە، گرنگی بەلایەنێکی دیکە داوە. لەم سۆنگەوە ڕۆژنامەکە لە (١ی تشرینی دووەمی١٩٧٢) بابەتێکی دیکەی هەستیاری وروژاندووە کە تایبەت بوو تۆمەتبارکردنی (٤٠) هەزار (کوردی فەیلی)١٤ بە ئەنجامدانی کاری سیخوری بۆ بەرژەوەندی ئێران لەدژی عێراق. بەو هۆیەوە ڕۆژنامەکە دەچێتە سەر ئەو تێڕوانینەی کە ئەم ڕەفتارانەی حکومەتی عێراقی، چاوەڕوانی هەڵگیرسانەوەی شەڕی لێدەکرێ لەگەڵ کورد. چونکە وەک ڕۆژنامەکە ئاماژەی پێکردوە، ئەم سیاسەتەی حکومەتی عێراقی پیادەی دەکرد، نارەزایی توندی لای مستەفا بارزانی دروستکرد. ئەوە سەرباری چەندین خاڵی دیکە، کە بەخاڵی ناکۆکی مانەوە لە نێوان سەرکردایەتی کورد و حکومەتی عێراقی و تەنانەت دوای ڕیککەوتنامەی ئاداری١٩٧٠ ، بەهەڵپەسێردراوی مانەوە وەک نەبوونی هیچ ئەندامێکی کورد لە ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش لە عێراق، لەبەرئەوەی بە بڕوای سەرکردایەتی کورد، ئەو دامەزراوەیە باڵاترین دەسەڵاتی بەڕێوەبردن بوو لە وڵات. تەنانەت هیچ کوردێک لەدەستەی ئەرکانی گشتی سوپای عێراقی نەبوو، نوێنەرایەتی گەلەکەی بکات لەم دامەزراوە سەربازییە. بۆیە ڕۆژنامەکە بەپشت بەستن بە هەڵوێستی سەرکردایەتی کورد بەرامبەر ئەم دۆخە. ئاماژە بۆ ئەوە کرد، کە ئەگەر حکومەتی عێراقی سیاسەتی خۆی نەگۆڕێ بەرامبەر بە کورد، ئەگەری هەیە هەر لەو ساڵەدا شەڕ جارێکی دیکە هەڵبگیرسێتەوە(דבר،1 נוֹבֶמְבֶּר1972، עמ'.7).

### 3.7: پرسی کوردە فەیلییەکان لە عێراقدا

تۆمەتەکانی حکومەتی عێراقی دەیبەخشییەوە بە کورد، شێوەیەکی گشتگیری وەرگرت، تەنانەت وەک ڕۆژنامەی(داڤار) لە ژمارەی (٣ی تشرینی دووەمی ١٩٧٢) لە بەباتێکدا بەناونیشانی (عێراقییەکان، کوردەکان تۆمەتبار دەکەن بە گواستنەوەی زانیاری سەربازی بۆ ئیسرائیل لە ڕێگەی ئێرانەوە) ئاماژەی بەوە کرد، "حکومەتی عێراقی هەموو کوردێک بە ئەنجامدانی کاری سیخوری تۆمەتبار دەکات بۆ بەرژەوەندی ئیسرائیل(דבר،3 נוֹבֶמְבֶּר1972، עמ'.1).

کاتێک دەستەی نووسەرانی ڕۆژنامەی(داڤار) گەیشتنە ئەو باوەڕەی هەڵگیرسانەوەی شەڕ لە نێوان حکومەتی عێراقی و سەرکردایەتی شۆڕشی کورد تەنها ماوەیەکی زەمەنی کورتی پێویستە، ڕاستەوخۆ یەکێک لە پەیامنێرەکانی خۆیان ڕەوانەی باشووری

کوردستان کرد کەناوی (ئیهود)ە. ئەم ڕۆژنامەنووسە دەقی ڕاپۆرتە ڕۆژنامەوانییەکەی خۆی لە بابەتێکدا بە ناونیشانی (بارزانی و پیاوەکانی تەنها نوێنەرنین، سەرۆکی عێراق ئەحمەد حەسەن بەکر دەڵێت) لە (١٥ی کانونی یەکەمی ١٩٧٢) بڵاوکردەوە، کە بەیەکێک لە بابەت و ڕاپۆرتە ڕۆژنامەوانییە سەرنج ڕاکیش و تایبەتەکانی ڕۆژنامەکە دادەنری، کە بەدرێژایی ماوەی خستنەڕووی دۆزی کورد لەسەر لاپەڕەکانی ئەم ڕۆژنامەیە نمونەی کەمی هاوشێوەی هەیە. ڕۆژنامەنووسەکە دەستپێکی باسەکەی لەم ڕاپۆرتەدا بە نیشاندانی وێنایەکی سروشتی ناوچە شاخاوییەکانی باشووری کوردستان دەست پێدەکات و هەڵگیرسانەوەی شەڕ دەبەستێتەوە بە ڕێگرییەکانی سروشت دروستی کردوون لەبەردەم سوپای عێراقی و جەنگاوەرانی کورد لە وەرزی سەرمادا، بەهۆی گیرانی ڕێگا و بانەکانی ئەم ناوچانە بە بەفر، ئەو پێی وایە هەموان لەم ساتانەدا چاوەڕوانی توانەوەی بەفرەکان دەکەن، بۆئەوەی جارێکی دیکە گوێبیستی دەهۆڵی جەنگی سەپێنراوی سوپای عێراقی بن بەسەر گەلی کورد. ڕۆژنامەنووسەکە ئاماژە بۆ ئەوە کرد، کە ئامانجی بارزانی بە مەبەستی هاوبەشکیردن لەدەسەڵات، جگە لە زیاتر کردنی دوژمنایەتی، هیچی دیکەی لێ نەکەوتەوە، لەبەرئەوەی ڕێککەوتنامەی ئاداری١٩٧٠ لە خەیاڵێک زیاتر نەبوو، ڕۆژنامەکە لە درێژەی باسەکەیدا، وەڵامی بۆچوونێکی جێگری سەرۆکی عێراق دەداتەوە کە پێی وایە بارزانی نوێنەرایەتی هەموو پێکهاتەکانی گەلی کورد ناکات و چینی ڕۆشنبیرانی کورد لە گەڵ بارزانی نین و لەم بارەیەوە نووسیویەتی:" لە دەوروبەری بارزانی، باشترین کەسانی ڕۆشنبیری کورد هەن، وەک پزیشک و ئەندازیار و پارێزەر، کە لە وڵاتانی ڕۆژئاوا خوێندنیان تەواو کردوە و بۆ شۆڕش گەڕاونەتەوە زێدی خۆیان. جگە لە نوێنەرانەی بارزانی کە بۆ بەشداریکردن لە حکومەتی عێراق لەبەغدا بوون و ژمارەیان چوار وەزیر بوو . ئەوان توانایان هەیە بەبێ هیچ هەستێک بە کەمایەتی مامەڵە لەگەڵ کوڕەکانی "بارزانییدا" بکەن، بەو پێیەی ئەمانە گەنجی پێشکەوتوون"... ڕۆژنامەنووسەکە لە ڕوونکردنەوەکەیدا دەڵێت:" بارزانی بارەگای خۆی لە باکوور بەجێنەهێشت. ئەوانی تر بۆ دانوستان لەبەغداوە دێنە بارەگایەکەی. سەرباری ئەوەی لە چوارچێوەی پرۆسەی ئاشتیدا، بەشێک لە پیاوەکانی بارزانی کران بە قائیمقامی قەزا و ئەفسەری پۆلیس. دەوترێت هەندێکیان ئاستێکی بەرزی بەڕێوەبردنیان لە کارەکانیاندا نیشانداوە"(דבר، 3 דֶּצֶמְבֶּר1972، עמ'.30). ئەمەش بە بڕوای ئێمە، پوخترین وەڵام و هەستێکی لۆژیکی بووە، کە ڕۆژنامەنووسەکە، بەبینینی ڕاستییەکان بۆی ڕوونبۆتەوە.

### 3.8: ئیسرائیل و شۆڕشی کورد

ڕۆژنامەی (داڤار) جیاواز لە بابەتەکانی دیکەی بڵاویکردنەوە، بەسوود وەرگرتن لە دیداری ژەنەراڵ( ئەهارون یاریف) لێپسراوی دەزگای هەواڵگری ئیسرائیل لەگەل گۆڤارێکی ئەمریکی، لە سەرەتای ساڵی ١٩٧٣، پەیوەندییەکانی حکومەتی ئیسرائیل بە بزاڤی ڕزگاریخوازی نەتەوەیی کوردی خستەڕوو، لە ڕێگای بڵاوکردنەوەی دەقی ئەم دیدارە لە ژمارەی(٨ی کانونی دووەمی ١٩٧٣)، کە لەنێوەڕۆکی باسەکەدا ژەنەڕاڵە ئیسرائیلییەکە دەڵێت:" لەسەرەتادا یارمەتییەکانی ئیسرائیل بۆ کوردەکان لەدوای بانگەوازی مەلا مستەفا بارزانی هات بۆ حکومەتەکەی تا هاوکارییان بکەن. ئەو کاتە دوو ئەفسەرمان ڕەوانەی باکووری عێراق کرد، ئەم دوو ئەفسەرە مەشق و ڕاهێنانیان بە جەنگاوەرە کوردەکان کرد، لەسەر چۆنیەتی بەکارهێنانی تۆپهاوێژەکان. سەرباری ئەمەش هەندێک چەکیان پێگەیشت کە لە ئیسرائیلەوە لە ڕێگەی ئێران بۆیان گوازرایەوە. ئەو چەکانە لە دروستکراوی سۆڤیەت بوون و لەشەڕی (٦) ڕۆژەی ١٩٦٧، ئیسرائیلییەکان دەستیان بەسەردا گرتبوو، بە کوردەکانیان بەخشی وەک یارمەتی و کۆمەکی جەنگی(דבר، 8 ינואר1973، עמ'.1).

بەپێی زانیارییەکانی ڕۆژنامەی (داڤار)، حکومەتی عێراق. لەدوای ئەنجامدانی ڕێککەوتن لەگەڵ سەرکردایەتی کورد لە ئاداری١٩٧٠، جارێکی دیکە سەرپێچی ڕێککەوتنەکەی خۆی لەگەڵ کورد کرد، لەڕێگەی بۆردومانکردنی چەند گوندێکی کوردی لەماوەی دووڕۆژ لە هەفتەی کۆتایی مانگی حوزەیران. ژمارەی قوربانیان کورد لەم بۆردومانانە گەیشتە (١٠) کوژراو و (٢٢) بریندار، زۆربەی قوربانیەکانیش لە ئەندامانی ئەو پارتە کوردیەن، کە مەلا مستەفا بارزانی ڕێبەرایەتی دەکات. هاوکات ڕۆژنامەکە باسی لەوە کرد، کە لەکاتێکی پێشووتر، (٤) کەسی لایەنگیری بارزانی کوژراون و (١٥) دیکەیان بریندار بوون، لە شەڕێکدا کە لەڕۆژی یەکشەممە لەو هەفتەیە ڕوویداوە لە نێوان جەنگاوەرانی بارزانی و سوپای عێراق(דבר، 28 יוני1973، עמ'.2). بەم شێوەیە ڕۆژنامەکە لە ڕێگەی بڵاوکردنەوەی ئەم هەواڵانە، سەرەتاکانی دەستپێکردنەوەی شەڕی کورد و حکومەتی عێراقی نزیک کردەوە.

ئەو پێشبینی و چاوەڕوانییەی ڕۆژنامەکە لە دەرئەنجامی ڕێککەوتننامەی ئاداری١٩٧٠ هەیبوو، لە (١٠ی ئاداری١٩٧٤) هاتەدی، کاتێک لە بابەتێکدا بەناونیشانی (بەغدا: ئۆتۆنۆمی بۆ کوردەکان لەبەیانییەوە ڕادەگەیەنی) بڵاوکردەوە. لەو باسەدا ڕۆژنامەکە نووسیویەتی:"حزبی بەعسی حوکمڕانی عێراق، دوێنی ڕایگەیاند، کە ئۆتۆنۆمی بە ناوچە کوردییەکانی باکوور دەدات، کە کوردەکان تیایدا زۆرینەی دانیشتوانەکەی پێکدەهێنن"(דבר، 10מרץ1974، עמ'.2). ئەمەش سەرەتای قەیرانێکی نوێ بوو لە پەیوەندی نێوان

سەرکردایەتی شۆڕشی کورد و دەسەڵاتدارانی بەغدا، کە بەهەڵگیرسانەوەی شەڕێکی نوێ دەستپێکردەوە، وەک لە تەوەرەی داهاتوو دەیخەینەڕوو.

### 4. هەرەسهێنانی ڕێککەوتنی ئاشتی و هەڵگیرسانەوەی شەڕ (١٩٧٤-١٩٧٥)

جوانی ئەو هێزەیە ڕاگەیاندنی یاسای ئۆتۆنۆمی لەلایەن حزبی بەعسی دەسەڵاتدار لە بەغدا، بەبێ ڕەزامەندی سەرکردایەتی کورد، بەشی زۆری خەڵکی کوردستانی خستە پاڵ جەنگاوەرانی بارزانی و بە کۆمەڵ ئەو خەڵکە ڕوویانکردە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی هێزە شۆڕشگێرەکانی کورد. بەو هۆیەوە وەک لە ژمارەی (١٤ی ئاداری١٩٧٤)ی ڕۆژنامەی (داڤار)دا هاتووە، حکومەتی تورکیا سنووری لەگەڵ عێراق داخست. لە نێوەڕۆکی ئەو باسەدا ڕۆژنامەکە ئاماژەی بۆ ئەوە کرد، کە حکومەتی تورکیا بڕیاریدا سنووری لەگەڵ عێراق دابخات، بۆ ڕێگریکردن لە پەرینەوەی ئاوارە کوردەکان بۆ ناو سنووری وڵاتەکەی. وەک ڕۆژنامەکە باسیکردوە، هەواڵەکانی لە ڕێگەی ڕۆژنامەنووسانی نزیک لە ڕووداوەکانی باشووری کوردستان دەگەنە ئەنقەرە، ئاماژە دەکەن بە سەرکەوتنی جەنگاوەرانی مەلا مستەفا بارزانی لە دەست بەسەرداگرتنی ناوچەکانی سنوور لەگەڵ تورکیا. لەدرێژەی هەواڵەکەدا ڕۆژنامەکە سەبارەت بە ئاڵۆزبوونی بارودۆخی ناوچەکە، باسی لەوە کرد، کە پارتی دیموکراتی کوردستان وەک هەڵوێستێک بەرامبەر ئەو بڕیارەی حکومەتی عێراقی، بارەگای ڕۆژنامەی (التاخی) لە شاری بەغدا داخست و چاوەڕوانیش دەکرێ چوار وەزیرە کوردەکەی نوێنەری شۆڕشی کوردن لە حکومەتی عێراقی دەست لەکاربکێشنەوە(דבר،14מרץ1974، עמ'.1).

سوفیر دفار، یەکێک بوو لە ڕۆژنامەنووسە دیارەکانی ڕۆژنامەی داڤار و شارەزابوو لە کاروباری عەرەبی، لە ژمارەی ڕۆژی(١٨ی ئاداری ١٩٧٤) لە چوارچێوەی خستنەڕووی ڕاگەیەنراوێکی مەلا مستەفا بارزانی ڕێبەری کورد سەبارەت بە هەڵوێستیان بەرامبەر ڕاگەیاندنی یاسای ئۆتۆنۆمی، کە لەلایەن حکومەتی بەغدا لە (١١ی ئاداری١٩٧٤) ڕاگەیەنرا، لەژێر وێنەیەکی گەورەی بارزانی، کە بەشی سەرەوەی لاپەڕەی یەکەمی ڕۆژنامەکەی پڕکرد، نووسیویەتی:" ڕاگەیەنراوی بارزانی، جەخت لەسەر هەڵگیرسانەوەی شەڕ دەکات". بەم جۆرە نووسەری بابەتەکە نووسیویەتی:"دیارە هەڵگیرسانەوەی شۆڕشی کورد بووە ڕاستی، لەگەڵ بڵاوبوونەوەی ڕاگەیەنراوی مەلا مستەفا بارزانی، کاتێک گوتی:"گەلەکەمان لە شۆڕش ناوەستێ تا هەموو مافەکانی بەدەست نەهێنێ"(דבר،18מרץ1974، עמ'.1).

ئەمانەی ئاماژەمان پێکردن لە پێشەوە، ئاماژەکانی هەڵگیرسانەوەی شەڕێکی نوێ بوون لە باشووری کوردستان ، لەنێوان حکومەتی عێراقی و هێزە شۆڕشگێرە کوردییەکان بە ڕێبەرایەتی مەلا مستەفا بارزانی. سەرباری هەڵوێستی نەرێنی حکومەتی عێراقی بەرامبەر ڕێککەوتنامەی ئاداری١٩٧٠ و پاشگزبوونەوەی لەو بەڵێن و بڕیارانەی هەیانبوو بۆ جێبەجێکردنی بڕگە و ماددەکانی ئەو ڕێککەوتنە، دوای ڕاگەیاندنی یاسای ئۆتۆنۆمی تاک لایەنە و ڕەتکردنەوەی بەشێوەیەکی فەرمی لە لایەن سەرکردایەتی سیاسی کورد، بەڵام بەپێی زانیارییەکانی ڕۆژنامەی(داڤار)، دانوستانەکان لە نێوان هەردوولای ناکۆک لە شاری بەغدا بەردەوام بوو بۆ گەیشتن بە ڕێککەوتن لەسەر خاڵە جیاوازەکانی نێوانیان. بەو هۆیەوە حکومەتی عێراق بۆ ماوەیەکی کاتی کە بە(٦) ڕۆژ دیاریکرابوو، پرۆسە سەربازییەکانی لە ناوچەکانی باشووری کوردستان ڕاگرت. بەپێی زانیاری ڕۆژنامەکە، تا ئەو کاتەش دەرفەتی ڕێککەوتن مابوو لەنێوان سەرکردایەتی کورد و حکومەتی عێراقی(דבר،20מרץ1974، עמ'.2). بەڵام ئەوەی لە ڕاستیدا گوزەری دەکرد، بەو شێوەیە نەبوو وەک ڕۆژنامەکە چاوەڕوانی دەکرد، بەڵکو هەر دوای دوو ڕۆژ هەواڵێکی دیکەی بڵاوکردەوە و تیایدا ئاماژەی بۆ ئەوە کرد، کە هێزە کوردییەکان، ئامادەسازی دەکەن بۆ شەڕ و لەم سۆنگەوە کاروانێکی چەکی پێشکەوتوویان بەدەست گەیشتووە کە بریتییە لە (١٠) موشەکی جۆری (١٠٥) ملم لە وڵاتێکی بیانی. ڕۆژنامەکە ناوی ئەم وڵاتەی ڕانەگەیاند، کە یارمەتی سەربازی بە کوردەکان ڕەوانەکرد، بەڵام باس لەوە کرد، کە ئەم چەکانە بە فڕۆکەیەکی تایبەت گەیشتونەتە یەکێک لە بنکە ئاسمانییە سەربازییەکانی ئێران و لەوێییەوە دەگوازرێنەوە بۆ هێزەکانی بارزانی. تەنانەت لەو هەواڵەدا، بەپشت بەستن بەو زانیاریانەی کە لە ئاژانسەکانی هەواڵی عەرەبی بەدەستی گەیشتووە، ڕۆژنامەکە ئاماژەی بۆ ئەوە کرد، کە هێزەکانی بارزانی لە ئەنجامی هێرشکردنیان بۆ سەر لیوایەکی سوپای عێراقی، دەستیان بەسەر سەربازگەکەیاندا گرت لە نزیک شارۆچکەی زاخۆ(דבר،،22מרץ1974، עמ'.1).

لەگەڵ گەرمبوونی بارودۆخی سیاسی و سەربازی لە عێراق، ڕۆژنامەکە بەدوای سەرچاوەی هەواڵی جیاواز گەڕاوە بۆ بەدەستهێنانی زۆرترین زانیاری لەسەر پێشهاتە سیاسی سەربازییەکانی ئەم ناوچەیە، لەم سۆنگەوە ڕۆژنامەکە لە (٢٨ی ئاداری ١٩٧٤) لە ڕێگەی بابەتێک بە ناونیشانی ( بارزانی هۆشداری دەدات لە مەترسی شەڕێکی گشتگیر) لە نووسینی (سوفیر دفار)ی شارەزا لە کاروباری عەرەبی، بڵاویکردەوە کە:" شەوی ڕابردوو مەلا مستەفا بارزانی هۆشدارییدا لە مەترسی شەڕی سەرتاسەری لە باکوری عێراق، حکومەتی بەغدای تۆمەتبار کرد بەوەی کە چاوپۆشی لەو داواکارییانە کردووە، کە سەبارەت بە یاسای نوێی ئۆتۆنۆمی خراوەتەڕوو. سەرباری ئەمەش، بارزانی بەڕوونی ئەوەی خستەڕوو، کە هێشتا دەرفەتی گفتوگۆ ماوە لەگەڵ سەرکردەکانی پارتی

بەعس. لە درێژەی بابەتەکەدا ڕۆژنامەکە ڕایگەیاند، سەرکردایەتی سیاسی کورد، هەڵوێستی فەرمی خۆی لە ڕێگەی ئیدریس بارزانی لە ڕۆژی (٥ی ئادار) گەیاندۆتە حکومەتی عێراق لە بەغدا و بەهیچ شێوەیەک بەو بژاردەی حکومەت سەبارەت بە ئۆتۆنۆمی ڕازی نابێت، وەک ڕایانگەیاندوە ڕەتی دەکەنەوە. بەو هۆیەوە حکومەتی عێراقی دوا مۆڵەتی بە ئیدریس بارزانیدا، بۆ ئەوەی لەماوەی نێوان (١٤تا١١ی ئادار) کۆتا هەڵوێستی خۆیان لەسەر یاسای ئۆتۆنۆمی نیشان بدەن و دوا مۆڵەتیش تا کاتژمێر (١٢)ی نیوەڕۆ چاوەڕییان دەکەن(דבר،28מרץ1974، עמ.2,1 ). نووسەری ئەم بابەتە، لەدیاریکردنی ڕێککەوتی سەردانی ئیدریس بارزانی و شاندی یاوەری بۆ بەغدا، کەوتۆتە هەڵەوە، لەبەرئەوەی ئەم شاندە کوردییە بەسەرۆکایەتی ئیدریس بارزانی لەڕۆژی (٨ی ئاداری ١٩٧٤) سەردانی بەغدایان کرد، دواجار لە گفتوگۆیەکانیان لەگەڵ حکومەتی عێراقی نەگەیشتنە ڕێککەوتن(محمد، ٢٠١٩، ل١٨٣).

لەئەنجامی نەگەیشتن بە ڕێککەوتن و قوڵبوونەوەی جیاوازییەکانی نێوان سەرکردایەتی کورد و حکومەتی عێراقی، جارێکی دیکە شەڕ لە باشووری کوردستان هەڵگیرسایەوە. هەر لە سەرەتای شەڕەکەشدا بەپێی زانیارییەکانی ڕۆژنامەکە (٢٣٠) سەربازی سوپای عێراقی بەدیلی کەوتنە دەستی هێزەکانی بارزانی. سەرباری کوژرانی سەدان سەربازی دیکەیان(דבר،2 אפריל1974، עמ.3). وەک پەرچەکردارێک لەبەرامبەر ئەو گورزە سەربازییەی هێزەکانی بارزانی لە هێزەکانی سوپای عێراقیان وەشاند، فڕۆکە جەنگییەکانی سوپا، دەستییانکرد بە بۆردومانکردنی گوند و شارۆچکەکانی کەوتبوونە ناوچەی شەڕ. بەو هۆیەوە ئێستگەی دەنگی کوردستانی عێراق کە بەنهێنی پەخشی خۆی بڵاودەکردەوە لەناو شاخەکاندا، ئاگاداری بەدانیشتوانی ناوچەکانی شەڕدا، بۆ خۆپارێزی لە هێرشە ئاسمانییەکان، پێویستە خەندەق دروست بکەن و خۆیان بپارێزن لە بۆردومانی فڕۆکە جەنگییەکان(דבר،10 אפריל1974، עמ.3). بەپێی زانیاری ڕۆژنامەکە، لەگەڵ هەڵگیرسانەوەی شەڕ، جەنگاوەرە کوردەکان، ڕێڕەوە چیاییە ستراتیژییەکان کەوتە ژێر دەستیان. هەموو ڕێگاکانی هاوتوچۆیان لە نێوان شارەکان لەگەڵ ناوچە شاخاوییەکان داخست و دەستیان بە ئەنجامدانی چاڵاکی سەربازی کرد و بەشێوازی شەڕی پارتیزانی لەگەڵ سوپای عێراقی. لەبەرامبەردا حکومەتی بەغدا بۆ زاڵبوون بەسەر ئەم دۆخە، پەنای برد بۆ ڕاکیشانی هەموو ئەوانەی توانای چەک هەڵگرتنیان هەبوو، تەنانەت ژمارەیەکی زۆری مێرد منداڵیان ڕاکێشا بۆ بەرەی شەڕ، ئەوە سەرباری ئەوەی دەستیانکرد بە هاندانی هۆزە نەیارە تەقلیدییەکانی بارزانی و پشتیوانیان کرد لە بەشێک لە سەرکردە جیابووەکانی نێو پارتی دیموکراتی کوردستان، بۆ دامەزراندنی پارتێکی هاوشێوەی(پارتی دیموکراتی کوردستان)ی لایەنگیری حزبی بەعس، بۆ چەواشەکردنی ڕای گشتی و دژایەتیکردنی بارزانی. لەلایەکی دیکە هەر بەپێی زانیاری ڕۆژنامەکە، لەدوای هەڵگیرسانەوەی شەڕ لە باشووری کوردستان، لە ماوەی تەنها چوار هەفتەدا، هەزاران کەس لەو کوردانەی دانیشتووی شار و شارۆچکەکانی باشووری کوردستان بوون، ڕوویانکردە شاخەکان، بەشێکیان بۆ پشتگیریکردنی هێزەکانی بارزانی و بەشێکی دیکەیان بە ئامانجی خۆ ڕزگارکردن لە بۆردومانی فڕۆکە جەنگیەکانی سوپای عێراقی ئاوارەی ئەو ناوچانەبوون، کە لەژێر دەسەڵاتی هێزەکانی بارزانیدا بوو. سەرباری ئەوەی گەرمبوونی بارودۆخی سیاسی لەگەڵیدا بە ئاراستەی هەڵوەشانەوەی حکومەتی عێراقی دەچوو، دوای ئەوەی بەپێی زانیارییەکانی شەفیق قەزاز(١٩٣٤-٢٠٢٠) کە ڕۆژنامەکە بۆ نیشاندانی وێنای بارودۆخەکە پشتی بە زانیارییەکانی بەستووە، بەشێکی ئەو خەڵکانەی بۆ پشتگیرکردنی شۆڕشی کورد هاتنە پاڵ هێزەکانی بارزانی، خەڵکی پسپۆڕ و شارەزان بوون لە بواری تەندروستی، بەجۆرێک بە گوتەی قەزاز ژمارەی ئەو کارمەندانەی تەندروستی (٥٠) پزیشک بوون و لەناوچە ئازادکراوەکانی ژێر دەسەڵاتی هێزەکانی بارزانی، دەستییان بە کارکردن کرد، لە دامەزراوە تەندروستییەکانی شۆڕش، ئەوە سەرباری ئەوەی کە (٤) وەزیرە کوردەکەی لەدوای ڕێککەوتنامەی ئاداری١٩٧٠ چوونە ناو حکومەتی عێراق، دەستیان لەکارکێشایەوە، لەبەرامبەردا حکومەتی عێراق(٥) کوردی لایەنگیری خۆی لە ئەنجومەنی وەزیران دامەزراند. ئەمەش وەک ڕۆژنامەکە ئاماژەی پێکرد، تەنیا لەپێناو ئەوەبوو، حکومەتی بەعس بەڕای گشتی ڕابگەیەنێ، کە گەلی کورد پشتگیری لە یاسای ئۆتۆنۆمی دەکات(דבר،10 אפריל1974، עמ.3).

ئەم ڕێکارانەی حزبی بەعسی دەسەڵاتدار لەبەغدا دژی مافە نەتەوەییەکانی گەلی کورد پیادەی کرد، پەرچەکرداری بەهێزی لەلای سەرکردایەتی سیاسی کورد دروستکرد و بەو هۆیەوە شەڕ لەبەرە جیاوازەکان بەدرێژایی سنوورەکانی عێراق لەگەڵ تورکیا و ئێران، ڕۆژ لەدوای ڕۆژ سەختر و دژوارتر دەبوو لەسەر سوپای عێراقی و جەنگاوەرانی کورد، وەک ڕۆژنامەی (داڤار) لە هەواڵێکی ڕۆژی(١٦ی نیسانی١٩٧٤) بەناونیشانی (شەڕ لە نێوان کوردەکان و عێراقییەکان) بڵاویکردەوە. لەم هەواڵەدا ڕۆژنامەکە ئاماژەی بۆ ئەوە کرد، هێزە کوردییەکان بە ڕێبەرایەتی مەلا مستەفا بارزانی، شەڕێکی سەخت لەبەرامبەر سوپای عێراقی ئەنجام ئەدەن لە باکووری عێراق، تەنانەت ڕۆژنامەکە بە سوود وەرگرتن لە زانیاری ڕۆژنامە ئێرانییەکانی، کە پەیامنێرەکانیان نزیک بوون لەبەرەکانی شەڕ گواستیەوە، هێزەکانی بارزانی فڕۆکەیەکی جەنگی سوپای عێراقییان لە شەڕێکدا خستە خوارەوە و (٣) فڕۆکەوانی سەرنشینی فڕۆکەکەیان بەدیلی کەوتۆتە ژێر دەست. هەر سەبارەت بەم بەرەی شەڕ وەک ڕۆژنامەکە بڵاویکردەوە، کەوتبووە ناوچەی (سپیلک)

کە (٣٠) کم لە ڕەواندوزەوە دووربوو لە باکووری عێراق، حکومەتی عێراقی بە (٤) هەزار سەرباز ئابلوقەی توندی خستە سەر هێزە کوردییەکان(דבר،16 אפריל1974، עמ.3).

لەگەڵ هەر گورزێکی سەربازی توندی هێزە کوردییەکان لە سوپای عیراقیان وەشاند، ئەوەی دوایی فشاری زیاتری خستە سەر خەڵکی سڤیلی دانیشتووی ناوچەکانی شەڕ، بەو هۆیەوە وەک لە هەواڵێکی ڕۆژنامەکەدا هات، لە (٣٠ی نیسانی ١٩٧٤)، لەماوەی دوو هەفتەی ڕابردوو[ مەبەستی پێش بڵاوکردنەوەی هەوالەکەیە] نزیکەی (٣٠٠) هاوڵاتی سڤیلی کورد لە ئەنجامی بۆردومانی فرۆکە جەنگییەکان کوژراون. داڤار لە بڵاوکردنەوەی ئەم هەواڵەدا، سوودی لە زانیاری ئێستگەی دەنگی کوردستانی عێراق وەرگرت. لە وردکاری زیاتری ئەو هێرشە ئاسمانیانەی سوپای عێراق بۆ سەر ناوچە کوردییەکان ئەنجامی ئەدا، ڕۆژنامەکە ئاماژەی بۆ ئەوە کرد، کە بۆردومانی فڕۆکە جەنگییەکان تەنها بۆ سەر شارۆچکەی (هەڵەبجە) لەماوەی دوو هەفتەدا (٢٠) جار دووبارە بۆتەوە و (١٣٠) هاوڵاتی لەئەنجامی ئەم هێرشە ئاسمانیانەدا کوژراون. لەلایەکی دیکە، ڕۆژنامەکە ئاماژەی بۆ ئەوە کرد، کە سەرباری ئەم دۆخە نارەحەتەی ڕووبەڕووی خەڵکی سڤیل بۆتەوە لە ڕووی مرۆییەوە، کەچی حکومەتی تورکیا بڕیاریدا بە داخستنی سنوورەکەی بەڕووی ئاوارە عێراقییەکانی بەهۆی مەترسیان لە هێرشە ئاسمانییەکان ڕوویانکردبووە سنووری ئەم وڵاتە. بەڵام حکومەتی تورکیا بەو بڕیارە ڕێگری کرد لە پەڕینەوەیان(דבר،30 אפריל1974، עמ.1).

ئەو بابەتە ڕۆژنامەوانیانەی لە (داڤار) بڵاوکرانەوە لەم ماوەیەدا، بەتایبەتی لەدوای هەڵگیرسانەوەی شەڕ، هەرچەندە زۆربەیان وەک هەواڵ و ڕێپۆرتاژی ڕۆژنامەوانی بڵاوکرانەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە هەندێ جار، نووسەر و ڕۆژنامەنووسانی ئیسرائیل، نووسینی تایبەتیان هەبووە لەسەر لاپەڕەکانی ڕۆژنامەکە، سەبارەت بەو بارودۆخەی لە عێراق لە ئارادابوو لە نێوان حکومەت و سەرکردایەتی کورد لە باشووری کوردستان. بۆ نمونەش (دیتریش ستروتمان) لە (٢٤ی ئایاری١٩٧٤) بابەتێکی بەناونیشانی (گەڕی شەشەمی شەڕی کورد بە بڕیارێک کۆتایی نایەت) بڵاوکردەوە، تیایدا ئاماژەی بۆ ئەوە کرد:" پیاوە کوردە بە ساڵاچووەکە ژەنەراڵ مستەفا بارزانی نامەیەکی نووسیوە و تیایدا هاتووە(کوردستان دەبێتە دەریای خوێن و دوژمن تیایدا دەخنکێ). ئەمەش بەو مانایە هات، کە پەرچەکرداری کورد لەوە بەهێزترە وەک حکومەتی عێراقی پێشبینی بۆ دەکات. بەڵام دەسەڵاتدارانی بەغدا وەڵامێکی توندیان دایەوە بارزانی و بۆیان نووسی(ئاشتی بەدی نایەت، تا بارزانی ئاڵای سپی خۆڕادەستکردن بەرز نەکاتەوە)(דבר،24 מאי1974، עמ.15).

ڕێکارەکانی حکومەتی عێراقی لەبەرامبەر گەلی کورد گرتیبەبەر، تەنها ڕێکاری سەربازی نەبوون، بەڵکو دەسەڵاتدارانی بەغدا ڕوویانکردە دەستگیرکردنی هەمو ئەوانەی بە نهێنی پشتگیری شۆڕشی کوردیان کرد. لەم نێوەندەشدا (٢) هەزار قوتابی کوردیان لەناوچە جیاوازەکانی عێراق دەستگیرکرد، کە (١) هەزار لەمانە، لەشاری بەغدا نیشتەجێ بوون. بەو هۆیەوە دەرفەتی خوێندیان لە زانکۆ لەدەستدا. سەرباری ئەوەی بە پشت بەستن بە زانیارییەکانی ئێستگەی دەنگی کوردستانی عێراق، ڕۆژنامەکە ڕایگەیاند، کە ژمارەیەک لە چاڵاکوانە سیاسییە کوردەکان لە موسڵ و بەغدا و کەرکوک لەسەر کارەکانیان دوورخراونەتەوە بەهۆی ئەنجامدانی کاری سیاسی نهێنی (דבר،26מאי1974، עמ.3).

بەکارهێنانی توندوتیژی لە دژی شۆڕشگێرانی کورد، گەیشتە ئەو ڕادەی سوپای عێراقی سەرپێچی یاسا نێودەوڵەتییەکانی جەنگ بکات و ئەو شۆڕشگێرانەی کورد کە بەدیلی دەکەوتنە دەستی سوپای عێراقی، زۆرکات وەک ڕۆژنامەی (داڤار) ئاماژەی پێکرد، دەکوژران. لە نمونەی ئەو هەواڵەی ڕۆژنامەکە لە (١١ی حوزەیرانی ١٩٧٤) بەناونیشانی (کوشتنی (٢٠) جەنگاوەری کورد لە عێراق) بڵاویکردەوە، کە ئەم کردەیە بە پێوەری یاسا نێودەوڵەتییەکان، تاوانی جەنگە، کە سوپای عێراقی لەبەرامبەر جەنگاوەرانی کورد ئەنجامی ئەدا و بەو هۆیەوە بە گوێرەی زانیارییەکانی ڕۆژنامەکە، پارتی دیموکراتی کوردستان، پێشنیازی کرد کە ڕۆژی (٩ی حوزەیران) لە هەموو ساڵێکدا بکرێتە (ڕۆژی شەهیدانی کورد) (דבר،11יוני1974، עמ.3).

دیارە ئەو هەڵمەتە بەرفراوانەی حکومەتی عێراق بۆ سەرکوتکردنی شۆڕشی کورد گرتیەبەر، دەنگدانەوەی نێودەوڵەتی هەبوو، بەڵکو هۆکارێک بوو بۆ ئەوەی بەشێک لە وڵاتان، هەوڵبدەن دەست بخەنە نێو بارودۆخەکە، لە بەرژەوەندی پلان و نەخشەی سیاسی خۆیان، لە دژی عێراق بێ یان بەپێچەوانەوە بۆ پشتگیرکردنی ئەم دەوڵەتە. ڕۆژنامەکە لەسەر ئەم بابەتە لە ڕۆژی (١١ی تەمموزی ١٩٧٤) هەواڵێکی بلاوکردەوە و ئاماژەی بۆ ئەوە کرد، کە کوردەکان بە پارە و چەک پشتگیری دەکرێن، بەڵام ناوی ئەو لایەنەی ئاشکرا نەکرد، کە یارمەتی شۆڕشگێرانی کورد ئەدات لە دژی سوپای عێراقی. بەڵام لەدوا ڕستەکانی ئەم هەواڵەدا، باسی لەوە کرد کە پێویستە سوود لەم کارتە وەربگیرێت، نەوەک سۆڤیەت سودیان لێ وەبگرێ. ئەمەش ئاماژەیەک بوو لەسەر ئەوەی ئەو هاوکارییانە لەلایەن بەرەی ڕۆژئاوا پێشکەشی کورد کراوە، بۆ ڕێگریکردن لە یەکێتی سۆڤیەت، نەوەک کوردەکان بەهۆی پێویستیان بە هاوکاری سەربازی، بخاتە بەرەی خۆیەوە لە دژی وڵاتانی ڕۆژئاوای ئەوروپا و ئەمریکا(דבר،11יולי1974، עמ.7).

پاڵپشتیکردنی شۆڕشگێرانی کورد، ئەوەندە کاریگەری ئەرێنی هەبوو لە ڕووی مەعنەوییەوە، ئەوەندە کاریگەری ماددی نەبوو. لەبەرئەوەی هاوکارییە دەرەکییەکانی بۆ شۆڕشگێرانی کورد هەبوون، لە سنوورێکی دیاریکراو بوو. بەو شێوەیە نەبوو پشتی پێ ببەسترێ، ئەگەر توانا و خۆڕاگری جەنگاوەرانی کورد نەبوایە. بۆ بەرگریکردن لە خاک و دۆزە نەتەوەییەکەیان. بەڵام وەک ئاماژەمان پێکرد، ئەم پشتیوانیە دەرەکییە لە مۆڕاڵی هێزەکانی کوردی بەرزکردەوە، بەو هۆیەوە جەنگاوەرە کوردەکان جیاواز لە شەڕی تەقلیدی، کاریانکرد بۆ لەکارخستنی سێکتەرە جیاوازەکانی دەوڵەت، لەو ناوچانەی لێیەوە نزیک بوون، بۆیە وەک ڕۆژنامەی (داڤار) لە (١٤ی تەمموزی ١٩٧٤) لە چوارچێوەی هەواڵەکانی لە بارەی شۆڕشی کورد بڵاویکردەوە، هەواڵی تەقاندنەوەی وێستگەیەکی ووزەی کارەبای بڵاوکردەوە، سەرباری دەست بەسەرداگرتنی چەند ناوچەیەکی گرنگی ستراتیژی لە دەوروبەری کەرکوک و شەنگال و چیای گارە(דבר،14יולי1974، עמ.2).

ئەو گورزە سەربازییانەی هێزەکانی پێشمەرگەی کوردستان لە سوپای عێراقیان وەشاند، حکومەتی بەغدای هێنایە سەر ئەو باوەڕەی، کە بەشەڕی مەیدانی لەگەڵ هێزە کوردییەکان سەرکەوتوونابێ، بۆیە هەوڵیدا لە ڕێگەی بڵاوکردنەوەی پروپاگەندەی نادروست، کار لەسەر دابەزاندنی وورەی جەنگاوەرە کوردەکان بکات و لەم چوارچێوەیەدا لە ڕۆژی (١ی ئەیلولی ١٩٧٤) ڕۆژنامەی (داڤار) بڵاویکردەوە، کە یەکێک لە ڕۆژنامە لایەنەگرەکانی ڕژێمی بەعسی عێراق لە لوبنان، کە ڕۆژنامەی (اليوم البيروتية) بوو، هەواڵی ڕاکردنی مەلا مستەفا بارزانی بۆ ئێران بڵاوکردۆتەوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر لە چوارچێوەی ئەو هەواڵەدا، ڕۆژنامەکە لەسەرچاوەیەکی عێراقی زانیاری وەرگرتووە، کە سوپای عێراقی دوای ئەوەی (١٢) کم چوونە ناو سنووری هێزە کوردییەکان، دواجار بەهۆی ئەوەی ڕووبەڕووی بەرگرییەکی سەخت بوونەوە لەلایەن هێزە کوردییەکان، سوپای عێراق پاشەکشەی کرد، بۆ ناوچەکانی خۆیان(דבר،1סֶפְּטֶמְבֶּר1974، עמ.3).

سەرباری ئەو سەرکەوتنانەی هێزە کوردییەکان بەرامبەر سوپای عیراق لە بەرەکانی شەڕ بەدەستیان هێنا، بەڵام شەڕەکە بووە هۆی تێکچوونی ژیانی خەڵکی دانیشتووی ئەو ناوچانەی پرۆسە سەربازییەکانی تێدا ئەنجام ئەدرا. بەجۆرێک بەهۆی بارودۆخی شەڕ و کاریگەرییەکانی لەسەر دانیشتوانی سڤیل، سەدان هەزار کەس لە خەڵکی کوردستان لەسەر زێدی خۆیان ئاوارەبوون و ڕوویانکردە سنووری وڵاتانی ئێران و تورکیا. ئەم ڕووداوەش وەک هەر ڕووداوێکی دیکە، لەماوەی جەنگ ، بووە جێگەی بایەخی ڕۆژنامەکە و لەم نێوەندەدا ڕۆژنامەکە بابەتێکی بەناونیشانی( ئاوارە کوردەکان ڕوودەکەنە ئێران) بڵاوکردەوە، کە یەکێک لە پەیامنێرەکانیان لە ئێران بەناوی (بورور شینبرغ) لە (٢ی ئەیلولی ١٩٧٤) ئامادەی کردبوو. لەم بابەتەدا پەیامنێرەکە لەسەر بارودۆخی شەڕی نێوان شۆرشگێرانی کورد و حکومەتی عێراقی نووسیویەتی:" دوای تێکچوونی پەیوەندییەکانی مەلا مستەفا بارزانی، لەگەڵ حکومەتی عێراق، جارێکی دیکە سەرلەنوێ خوێن ڕشتن گەڕایەوە، بەڵام ئەمجارە هاوشێوەی نییە، لەبەرئەوەی ژیانی کوردەکان لەماوەی نێوان تەنها (٣) مانگی ڕابردوو، بە (١٠) هەزار کەس دەخەمڵێنرێ، سەرباری ئاوارەبوونی (٨٠) هەزار کەس لە ژن و پیاوی بەساڵاچوو، لەسەر زێدی خۆیان، بەهۆی بەرێوەچوونی پرۆسە سەربازییەکان و بۆردومانی فرۆکە جەنگییەکان. لەبەدواداچوونی بارودۆخی ئاوارەکان، ڕۆژنامەکە چەند کەمپێکی ئاوارەکانی لە شاری کرمانشاە سەردانی کرد، کە (٧٠٠) کم لە ڕۆژئاوای تاران و (٧٠)کم لە سنووری ئێران لەگەڵ عێراق دوور بوو. بەپێی زانیاری ڕۆژنامەنووسەکە، ئەم کەمپە یەکێک بووە لەم (٨) کەمپەی حکومەتی ئێران بۆ ئاوارە کوردەکانی دامەزراند، لەسەر خاکی خۆی و بڕی (٧٠) ملیۆن دۆلاریشی تەرخانکرد، بۆ دابینکردنی پێداویستییەکانیان(דבר،2סֶפְּטֶמְבֶּר1974، עמ.7).

دیارە لەگەڵ گەشەکردنی زیاتری شەڕ و ڕووبەڕووبوونەوە سەربازییەکان، هێزە کوردییەکان ناوچەیەکی ستراتیژییان لەدەستدا بەرامبەر سوپای عیراقی، ئەمیش کەرتی (ڕەواندوز) بوو. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا سنوورێکی بەرفراوانیان لەناوچە سنوورییەکانی نێوان عێراق و ئێران لەژێر دەستدا مایەوە. بەو هۆیەوە ئەو زانیارییانەی ڕۆژنامەکە لەسەر گۆڕانی ڕێرەوی شەڕ لەباشووری کوردستان، خستیەڕوو لە بابەتێکدا بەناونیشانی (سوپای عێراق فشار لەسەر کوردەکان دروست دەکات) کە لە(٨ی ئەیلولی١٩٧٤) بڵاویکردەوە، باسی لەوە کرد، جەنگاوەرە کوردەکان بەدرێژایی (٧٠٠) هەزار مەتر لە سنووری عێراق و ئێران لەژێر فشاری هێرشی سوپای عێراقدان، بەڵام بارودۆخی کوردەکان تا ئیستا جێگیرە و مایەی دوو دڵی نییە، سەرباری ئەوەی حکومەتی عێراق بە زرێپۆش و هاوکاری هێزێکی بیانی هێرشی سەر ناوچە کوردییەکان دەکەن، ئەوەندە نەبێ دۆخەکە کاریگەریی هەبووە لەسەر ئاوارەبوونی ژمارەیەکی زۆری خەڵکی کوردستان بۆ ناوچە شاخاوییەکان بەمەبەستی پەڕینەوەیان بۆ ئەودیوی سنووری ئێران، کە بەپێی خەمڵێنی ڕۆژنامەکە ژمارەی ئەو خەڵکە نزیکبوون لە (٢٥٠) هەزار کەس، بەڵام وەک ڕۆژنامەکە ئاماژەی پێکردووە، حکومەتی ئێرانی بەخەمساردییەوە مامەڵە لەگەڵ بارودۆخەکە دەکات و مۆڵەتی تەنها بە (٨٠) هەزار کەس داوە بپەڕنەوە وڵاتەکەی، ئەمەش دۆخێکی مرۆیی ترسناکی لەسەر ژیانی ئەو خەڵکە دروستکرد. بەم شێوەیە کاریگەریی شەڕەکە هەرچەندە بەسەر هەردوو لایەنی شەڕکەر

بەهێزبوو، بەڵام لەسەر هێزە کوردییەکان زیاتر بوو، بەهۆی ئەو خەڵکەی لەناوچەکەدا تێکەڵ بەشەڕەکەبوون و ئەرکی پاراستن و گوزەرانیان لەنێو دۆخێکی هەستیاری لەم شێوەدا بۆ سەرکردایەتی سیاسی کورد قورس بوو. بەڵام سەرباری ئەم دۆخەش، هێزەکانی بارزانی بەردەوامیان بەشەڕەکەدا و تەنانەت زیانی گەورەیان بە سوپای عێراق گەیاند و بەپێی زانیاری ڕۆژنامەکە، (٣) هەزار سەربازی عێراقییان لە چوارچێوەی چالاکیە پارتیزانییەکان کوشتن. ئەم شەڕەی هێزە کوردییەکان بەرامبەر سوپای عێراقی ئەنجامیاندا، هاوشێوەی بەرامبەرەکەی، پشتیوانی دەرەکی هەبوو، بەشێوەیەک وەک ڕۆژنامەی (داڤار) بە پشت بەستن بە زانیاری سەرچاوەیەکی کوردی باسیکرد، هێزە کوردییەکان لەو ماوەیدا بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی تانک و زرێپۆشەکانی سوپای عێراقی، بەڵێنیان لەلایەنێکی دەرەکی وەرگرتوە کە موشەکی دژە تانکیان بۆ دەستەبەر بکەن، بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئامرازەکانی جەنگی عێراقی(דבר،8ספטמבר1974، עמ.3).

سەرکردایەتی سیاسی کورد، پشتیوانی دەرەکی بە هۆکارێکی کاریگەر دەبینی بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی شەڕی نابەرامبەریان بەرامبەر سوپای عێراق، کە بەهاوکاری چەک و تەقەمەنی و شارەزایانی سەربازی سۆڤیەتی، هەوڵی لەناوبردن و سەرکوتکردنی شۆڕشی کوردی ئەدا. ئەم زانیارییانەی وەک چۆن گەیشتبووە دەستی سەرکردایەتی کورد، کە سوپای عێراقی بەهاوکاری سۆڤیەت شەڕی کورد دەکات، لەسەر لاپەڕەیەکی ڕۆژنامەی(داڤار) لە تۆی بابەتێکدا بەناونیشانی (جەنگاوەرە کوردەکان: ڕووسەکان شەڕی ئێمە دەکەن) لە (٢٧ی ئەیلولی١٩٧٤) بڵاوکردەوە. لە خستنەڕووی ئەم زانیارییانەدا ڕۆژنامەکە باسی لەوە کرد، پەیامنێرە ئەمریکییەکانی نزیک بوون لەبەرەی شەڕی کورد لەگەڵ سوپای عێراق، ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە فڕۆکەوانە سۆڤێتییەکان، بەشدارن لە هێرشی سوپای عێراق بۆ سەرپێگەی کوردەکان لەبەرەکانی شەڕ(דבר،27ספטמבר1974، עמ.3).

ئەم دۆخەی لەبەرەکانی شەڕ، ناوچەکانی باشووری کوردستان پێیدا تێدەپەڕی، دواجار وەک چۆن بووە هەواڵی گەرمی زۆربەی ڕۆژنامە جیهانییەکان، هاوکات کەناڵە بینراوەکانی ڕۆژنامەوانی جیهانی کەوتنە ژێر کاریگەریی، و لە هەواڵێکی ڕۆژنامەی(داڤار) هات، تەلەفزیۆنی فەرمی بریتانیا لە بەرنامەی ئێوارانیدا، فلیمێکی دکیۆمێنتاری لەسەر کورد و شۆڕشەکەی لە باشووری کوردستان لە مانگی تشرینی یەکەمی ١٩٧٤ پەخشکرد(דבר،31אוקטובר1974، עמ.2).

بۆ هەڵوێستی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی بەرامبەر ئەم دۆخەی ڕووبەڕووی گەلی کورد بویەوە لە باشووری کوردستان لەسەر دەستی سوپای عێراقی، بەهاوکاری ئامرازە پێشکەوتووەکانی جەنگی سۆڤیەت، نەبووە هۆی دابەزینی توانای جەنگاوەرانی کورد لە شەڕەکەیاندا لە پێناو مانەوە و بەردەوام بوون لە خەباتیان بۆ بەدەستهێنانی مافە نەتەوەییەکانیان، بەڵکو ڕۆژنامەی (داڤار) بە پێچەوانەی چاوەڕوانییەکانی حکومەتی عێراقی بۆ سەرکوتکردن و کۆتاییهێنان بە شۆڕشی کورد، لە ڕێگەی بڵاوکردنەوەی هەواڵێک بە ناونیشانی ( کوردەکان، عێراقییەکان لە دەشتی نەینەوا دەردەکەن)، ئەم ئومێدەی حکومەتی عێراقی لاواز کرد، بەشێوەیەک وەک ڕۆژنامەکە نووسیویەتی:" هەڵگەڕاوە کوردەکان لە باکووری عێراق، هێزەکانی حکومەتی عێراقیان ناچارکرد ، لەناوچەکانی دەوروبەری موسڵ پاشەکشە بکەن"(דבר،14ינואר1975، עמ.1). بەم شێوەیە ئەم بارودۆخە سۆڤێتییەکانی ناچارکرد، چەکی پێشکەوتووتر بەسوپای عێراق بدەن و ڕۆڵێکی کاریگەرتر ببینن بۆ یەکلاییکردنەوەی شەڕەکە لە بەرژەوەندی سوپای عێراقی. لەم چوارچێوەیەشدا وەک ڕۆژنامەی(داڤار) لە هەواڵێکدا بەناونیشانی (سۆڤیەت موشەکی (زەمین – زەمین) بە عێراق دەدات) لە (٢ی شوباتی١٩٧٥) بڵاویکردەوە ، یەکێتی سۆڤیەت موشەکی (زەمین – زەمین) بە سوپای عێراق ئەدات و ڕادەی بەشداریکردنی شارەزا سەربازییەکانی لە عێراق بەرزکردۆتەوە، لە پێناو ئاشناکردنی سەربازە عێراقییەکان لە بەکارهێنانی ئەم جۆرە موشەکە، لەبەرئەوەی چەکێکی کاریگەربوو (דבר،2פברואר1975، עמ.3).

دەستێوەردانی زلهێزەکان لە شەڕەکەدا، گۆڕانی بەسەر هاوسەنگی هێزدا هێنا. ئەم دۆخەش هاوکاربوو بۆ ئەوەی حکومەتی عێراق، بیر لە کۆتایی پێهێنانی شەڕەکە بکاتەوە، بەهەر شێوازێک بێت. لەم سۆنگەوە ڕۆژنامەی(داڤار) لە هەواڵێکدا بەناونیشانی (هەوڵی عێراق لە پێناو کۆتاییهێنانی هەڵگەڕانەوەی کوردەکان) لە (١٣ی ئاداری١٩٧٥) نووسی:" ئەو ڕێککەوتنە (ئێرانی- عێراقی)یەی دوایی کە لە جەزائیر پێیگەیشتن بەهاوکاری (بومیدیەن) لە نێوان شای ئێران و سەدام، ئایا ئێران ڕازی دەبێ بە دەست هەڵگرتن لە کوردەکان . بەپێی ڕاپۆرتەکان، ئەو ڕێککەوتنە ئامانجی لەناوبردنی گەلی کوردە. داخستنی سنووری ئێران لەبەردەم پەنابەرانی کورد، ڕێگە بە عێراقییەکان دەدات، هەڵگەڕانەوەی کورد لەناو ببەن. هەرچەندە سیاسەتی ئێران گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە، بەڵام مەلا مستەفا بارزانی، بڕیاریداوە بەردەوامی بە شەڕ بدات، بەو هۆیەوە کوردەکان پلانیان دەگۆڕن، لە شوێنی شەڕی تەقلیدی لەگەڵ سوپا، شەڕی پارتیزانی ئەنجام ئەدەن، دابەشی سەر گروپی بچووک دەبن لەناو شاخەکاندا. دیارە شای ئێران لە کۆبوونەوەیەک لە جەزائیر لە ڕۆژی پێنج شەممە، ڕازی بوو لەسەر کشاندنەوەی پاڵپشتی خۆی بۆ کوردەکان، لەبەرامبەر دانپێدانانی عێراق بەسەروەری ئێران لەسەر کەنداوی عەرەب و ڕێڕەوە ئاوییەکەی. ڕێککەوتنەکە جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە، کە پێویستە ئێران

دەست هەڵبگرێ لە پاڵپشتیکردنی کوردەکان. بەو هۆیەوە کوردەکان لە ئێران تورەن. ئێران هەندێک پاڵپشتی و یارمەتی سەربازی بە کوردەکاندا وەک موشەکی دژە تانک و کەلوپەلی دیکەی جەنگی و ڕێگەدان بە پەنابەرانی کورد بۆ ئەوەی بپەڕنەوە سنوورەکانی و شوێنی بۆ دابینکردن و ڕێگەیدا بە گواستنەوەی هاوکاری و یارمەتییە دەرەکییەکان لە ڕێگەی وڵاتەکەیەوە بۆ کوردەکان(דבר،13מרץ1975، עמ.1).

بە پێی ڕاپۆرتێکی ڕۆژنامەی (داڤار)، مەلا مستەفا بارزانی لە ڕۆژی چوارشەممە(٢٢ی ئاداری ١٩٧٥) یاداشتێکی داوەتە لێژنەی مەرکەزی پارتی دیموکراتی کوردستان، بۆ ڕاگرتنی شەڕ، ئەمەش نارەزایی زۆری لێکەوتۆتەوە و تەنانەت دوو لە ئەندامانی سەرکردایەتی پارتەکە، ئامادەییان نیشانداوە لە بڕیارەکەی بارزانی هەڵبگەڕێنەوە ئەگەر فەرمان بکەن بە چەکدانان. ڕۆژی پێنج شەممە (٢٣ی ئاداری ١٩٧٥) ئێستگەی دەنگی کوردستانی عێراق بڕیاریدا پەخشەکەی ڕابگرێت. هاوکات ژمارەیەک لە جەنگاوەرانی کورد لە حاجی ئۆمەران بڕیاریانداوە بەردەوامی بە شەڕ بدەن لەبەرامبەر سوپای عیراقی بەبێ مەلا مستەفا بارزانی. سەرباری ئەوەی سێ هێزی کوردەکان کە هێزەکانی (خەبات، ڕزگاری، زمناکۆ) بوون، بڕیاریاندا بەردەوامی بەشەڕ بدەن کە هەریەک لەم هێزانە (٣) هەزار جەنگاوەریان هەیە(דבר،24מרץ1975، עמ.3). دوای تەنها ڕۆژێک لە بلاوکردنەوەی ئەم هەواڵە ڕۆژنامەکە بەسوود وەرگرتن لە زانیاری ئاژانسی(ئەسوشیتید پرێس) لە بابەتێکدا بەناونیشانی (بارزانی تا ئێستا لە عێراقە) بڵاویکردەوە، کە ڕێبەری کوردەکان مەلا مستەفا بارزانی کە تەمەنی(٧٦) ساڵە دوای ئەوەی لە بارەگای خۆی لە حاجی ئۆمەران ڕایگەیاند، مەبەستی هەیە داوای پەنابەرێتی لە وڵاتێکی بیانی بکات(דבר،25מרץ1975، עמ.3).

(دواجار هەڵگەڕانەوەی کورد کۆتاییهات)، کۆتا ناونیشانی ڕۆژنامەی داڤار بوو لە ژمارەی ڕۆژی(٢٤ی ئاياری ١٩٧٥) لەسەر درێژترین شۆڕش لە مێژووی هاوچەرخی کورد بڵاویکردەوە. بەم شێوەیە کۆتاییهێنا بە قۆناغێکی سەخت و دژواری خەباتی کورد لە ماوە مێژووییەدا لەپێناو بەدەستهێنانی ئۆتۆنۆمی و مافە نەتەوەییەکانی کورد، کە بەهۆی دەستێوەردانی وڵاتە زلهێزەکان لە پرسەکە، نەهاتەدی (דבר،4מאי1975، עמ.3).

## 4_ئەنجام:

١- ڕۆژنامەی(داڤار) هاوشێوەی تەواوی دەوڵەت و دامەزراوە سیاسییە نێودەوڵەتییەکان، دۆزی کوردی لە باشووری کوردستان، وەک پرسێکی ناوەخۆیی عێراق سەیر کردوە، ئەم ئاڕاستە سیاسیەی ڕۆژنامەکەش، بەکاریگەریی ئەو ڕێککەوتننامەیە دروست بوو، کە لە (١١ی ئاداری ١٩٧٠) لە نێوان سەرکردایەتی کورد و حکومەتی عێراقی واژووکرا. لەم ڕێککەوتنامەیە و ساڵانی دواتریش، یەکەم داواکاری کورد، ئۆتۆنۆمی بووە لە چوارچێوەی عێراقدا.

2- ڕۆژنامەکە بەدرێژایی ماوەی توێژینەوەکە، بەشێوەیەکی ئاشکرا هاوسۆزی لەگەڵ دۆزی کورد نیشانداوە، لەچوارچێوەی کاری پیشەییانەی خۆی، لە ڕێگەی گواستنەوەی وێنای ڕاستەقینەی ڕووداوەکانی باشووری کوردستان و وەڵامدانەوەی هەموو ئەو چەواشەکارییانەی هەبوون بۆ بەلاڕێدابردنی پرسەکە لەسەر ئاڕاستە دروستکەی خۆی.

3- بەشی زۆری هەواڵ و بابەتە ڕۆژنامەوانییەکانی ڕۆژنامەکە، لە ئاژانس و دەزگای ڕۆژنامەوانی دیکە وەرگیراون و بەشێکی تریان بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ لە ڕێگەی پەیامنێرەکانی لە بەرەی شەڕی کورد و حکومەتی عێراقی ئەنجامدراوە، ئەمەش تا ڕادەیەک کۆی ئەو هەواڵ و بابەتانە وابەستەی دیدی ڕۆژنامەوانیی دەزگا و ناوەندە ڕۆژنامەوانییەکانی سەرچاوەکانیان دەکات.

## 5. پەراوێزەکان:

**(١)-** ئەم ناوە بەمانای (شوان) یان (سەرکردە) دێت لە زمانی عیبری.hebrew-academy.org.il/keyword

(٢)- یەکێتی گشتی سەندیکاکانی کرێکارانی ئیسرائیلیە، لە ساڵی ١٩٢٠ لە شاری (حەیفا) دامەزراوە، بە ئامانجی یەکخستنی کرێکارانی جوولەکە لەسەر خاکی ئیسرائیل. دوای دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسرائیل، چالاکییەکانی ئەم ڕێکخراوە، بەشێکی بە حکومەتی ئیسرائیل بەسترایەوە. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: Harry,Fitless, (1966), History of the cooperative movement in Israel, London.

(٣)- چالاکوانێکی سیاسی چەپڕەوی ئیسرائیلی بووە، بۆ زانیاری زیاتر بروانە:.Lavin, John, (1979), The Israeli mind,London.

(٤)- ئەم کێشەیە لەدوای کۆتاییهاتنی جەنگی یەکەمی جیهانی لەنێوان تورکیا و بریتانیا سەریهەڵدا، سەبارەت بە دیاریکردنی چارەنووسی موسڵ، ئایا سەر بەعێراق دەبێت یان تورکیا. بەو هۆیەوە لە(٢٧ی کانونی دووەمی ١٩٢٥) لێژنەیەک بە ئەندامیەتی نوێنەرانی بریتانیا و تورکیا گەیشتنە شاری موسڵ، بۆ دیراسەکردنی بەڵگەنامەکانی تایبەت بەو پرسە. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: السمر, عمار علي، شمال العراق(1958-1975)، دراسة سياسية، المركز العربي للآبحاث و دراسة السياسات، 2012.

(٥)- لەبارەی ڕاپەرینەکەی شێخ مەحمود بڕوانە: عبدالرحمن أدريس صالح البياتي، الشيخ محمود الحفيد(البرزنجي)و النفوذ البريطاني في كردستان ، دار الحكمة ، لندن، 2007.

(٦)- لەبارەی ڕاپەرینی یەکەمی بارزان(١٩٣١-١٩٣٢) بڕوانە: مهند علي فرحان الجبوري، الشيخ أحمد البارزاني وأثره الاجتماعي والسياسي في كردستان العراق 1896-1969، دار سپیرێز، دهوک، ٢٠١٧.

(٧)- لەبارەی ڕاپەرینی دووەمی بارزان(١٩٤٣-١٩٤٥) بڕوانە: د. مستەفا محمەد کەریم، شۆڕشی دووەمی بارزان هۆکار و دەرئەنجامەکان(١٩٤٣-١٩٤٥)، هەولێر،(٢٠٢٢)،

(٨)- لەبارەی کۆماری کوردستان، بروانە: هوزان سليمان الدوسكي، جمهورية كوردستان(دراسة تاريخية-سياسية)،أربيل،2005.

(٩)- لەبارەی ژیانی بارزانییەکان لە سۆڤیەت لە ماوەی نێوان ساڵانی (١٩٤٧-١٩٥٨)، بڕوانە:

O.I. Zhigalina. Мулла Мустафа Барзани (историческое фото), Институт востоковедения, .Москва, 2013

(١٠)- سەبارەت بە گەڕانەوەی بارزانییەکان لە سۆڤێتەوە بۆ عێراق، بروانە: د. دينيس كوماروف، البارزاني و نضال الاكراد الجنوبيين، في: البارزاني و شهادة ألتاريخ (مجموعة أبحاث و أنطباعات للمولفين الكورد والروس)، ت: د. بافي نازى، عبدي حاجي، سپيريز، دهوك، 2005.

(١١)- سەبارەت بە بڕیاری لێبوردنی گشتی بۆ بارزانییەکان لە ساڵی ١٩٥٨، بروانە: د.نوري عبدالحميد العاني وأخرون، تاريخ الوزرارات العراقية في العهد الجمهوري (14تموز 1958- 7 شباط 1959)، ج 1، بغداد، 2000.

(١٢)- سەبارەت بە هەڵگیرسانی شۆڕشی کورد لە ساڵی ١٩٦١، بروانە: عصمت شريف وانلي، كردستان العراقية هوية وطنية (دراسة في ثورة 1961)، ت:د. سعاد محمد خضر، مطبعة شفان، السليمانية, 2012،

(١٣)- بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: فەرەیدوون عەبدولڕەحیم عەبدوڵڵا، بارودۆخی سیاسی کوردستان- عێراق (١١ی مارت ١٩٧٠-١١ی مارتی ١٩٧٤) ،هەولێر، ٢٠٠٨،

(١٤)- سەبارەت بە یاننامەی عەبدولڕەحمان بەزازی سەرۆک وەزیرانی عێراق لە حوزەیرانی ١٩٦٦، بروانە: الاستاذ البزاز يتلو بيان الحكومة حول سياستها في شمال الوطن، العرب(جريدة)، ع(613)، 30 حزيران 1966،

(١٥)- سەبارەت بە کوردە و فەیلییەکان و سیاسەتی حزبی بەعس لە بەرامبەریان، بڕوانە: غلام،اسراء نورى.( ٢٠٢١)، الكرد الفيليون فى العراق جدلية المواطنة وتراجيديا التهجير، دمشق.

## ٦- لیستی سەرچاوەکان :

### ڕۆژنامەکان

#### -بەزمانی عیبری

- **داڤار/ דבר**


- (No:175)،25 דצמבר 1925،
- (No:2081)، 1 אַפְּרִיל 1932،
- הכורדים מבקשים עצמאות،(No:6309)، 19 אַפְּרִיל 1946،
- (No:6346)، 3 יוני 1946،
- (No:7071)، 12 אוֹקְטוֹבֶּר 1948،
- חלקם של הכורדים באירועים، (No:10094)، 15 אוגוסט 1958،
- המרד הכורדי בטסבוש, עיראק،(No:11034)، 17 סֶפְּטֶמְבֶּר 1961،
- המרד הכורדי יחודש בצפון עיראק،(No:11123)، 2 /1/ 1962،
- נחתם הסכם שלום בין בגדד לכורדים،(No:13617)، 12 /3/ 1970،
- ברזני: ההסכם החדש טוב יותר מ"תוכנית באזז"،(No:13620)، 16 /3/ 1970،
- (No:13632)، 30 /3/ 1970،
-בגדד: "כוחות עיראקים נוספים לחזית הישראלית"،(No:13650)،20 אַפְּרִיל1970،
- קירקוק הוא המפתח،(No:13727)،23 יולי1970،
- (No:13767)،8ספטמבר1970،
- מוסטפא ברזאני, התובע החוקר،(No:13854)،23 דֶּצֶמְבֶּר1970،
- (No:13933)،26 מרץ1971،
- התעוררות כורדית בטורקיה، דבר،(No:13968)،9 מאי1971،

- המשבר בין הכורדים לבגדד עשוי להתחדש. קרבות קיץ،(No:14015)، דבר،9 יולי1971،
- לה מוג'אד, קרב עז התחולל בין הכורדים לצבא בצפון עיראק،דבר،(No:14021)،21יולי1971،
- קריאה להקמת חזית עממית בעיראק הכוללת כורדים וקומוניסטים، (No:14054)، 30 אוגוסט1971،
- בגדד ממריאה. משלחת שלום לברזני ،(No:14080)، 3 אוֹקְטוֹבֶּר1971،
- ההתנקשות בברזני היא פרי עבודתם של מומחים، (No:14083)،7 אוֹקְטוֹבֶּר1971،
- איראן קוראת לכורדים לחדש את המלחמה בעיראק،דבר،(No:14146)،22 דֶּצֶמְבֶּר1971،
- האיום הכורדי במסע ההתנגדות של ממשלת עיראק، ،(No:14452)، 14אוגוסט1972،
- (No:14518) ،1 נוֹבֶמְבֶּר1972،
-העיראקים מאשימים את הכורדים בהעברת מידע צבאי לישראל דרך איראן ،(No:14518)،3 נוֹבֶמְבֶּר1972،
- מאת אהוד،ברזני ואנשיו אינם הנציגים היחידים של הנשיא העיראקי היחיד, חסן אל-בכר ،(No:14555)، 15דֶּצֶמְבֶּר1972،
- סיפור "מבארני"،דבר،(No:14575)، ،8 ינואר1973،
- עיראק הפציצה כפרים כורדים،דבר،(No:14717)، 28 יוני1973،
- בגדאד: אוטונומיה לכורדים החל ממחר،דבר،(No:14932)، 10מרץ1974،
- טורקיה סגרה את גבולותיה עם עיראק،דבר،(No:14936)، ،14מרץ1974،
- קריאתו של ברזני מאשרת את חידוש המרד הכורדי ،(No:14939)، דבר،18מרץ1974،
- עיראק עוצרת את הקרב עם הכורדים،(No:14941)،20מרץ1974،
- ארוזו!" שלח מטוסים לכורדים ،(No:14943)،22מרץ1974،
- ברזגי מזהיר מפני הסכנה של מלחמה כוללת ،(No:14948)،28מרץ1974،
- הכורדים טוענים כי י' הרג מאות חיילים עיראקים ،(No:14952)،2 אַפְּרִילץ1974،
- חיל האוויר העיראקי החל להפציץ את המורדים ،(No:14958)،10 אַפְּרִילץ1974،
- קרבות בין כורדים לעיראקים،(No:14963)،10 אַפְּרִילץ1974،
- 300 אזרחים כורדים נהרגו בהפצצות،(No:14974)،30 אַפְּרִילץ1974،
- (No:14994)،24 מאי1974،
- 2000 כורדים עצורים בעיראק ،(No:14995)،26 מאי1974،
- (No:15008)،11 יוני1974، עמ.3.
- ארגון המשטר בים סוף ،(No:15034)،11 יולי1974،
- הכורדים פוצצו תחנת כוח ،(No:15036)،14 יולי1974،
- (No:15077)، 1סֶפְּטֶמְבֶּר1974،
- הם נוהרים לאיראן، (No:15078)، 2סֶפְּטֶמְבֶּר1974،
- צבא עיראק מפעיל לחץ על הכורדים בפנים. מסע גירוש והשמדה، (No:15083)، 8סֶפְּטֶמְבֶּר1974،
-מורדים כורדים: הרוסים נלחמים בנו، (No:15097)،27 סֶפְּטֶמְבֶּר1974،
- מטוסי מיג הוכנסו לתקוף יישובים כורדיים، (No:15124)،31סאוֹקְטוֹבֶּר1974،
- הכורדים העיראקים גורשו מעמק מוסול، (No:15188)،14 ינואר1975 ،
- לבורזום סופקו לעיראק טילי סקאד، (No:15204)،2 פברואר1975 ،
- המאמצים העיראקים להחלטה הסופית של הכורדים، (No:15204)،13 מרץ1975 ،
- בבקשה אל תדאג בקשר לזה.، (No:15247)،24 מרץ1975 ،
- ברזני עדיין בעיראק،דבר، (No:15248)،25 מרץ1975 ،
- המרד הכורדי הסתיים סוף סוף،דבר، (No:15278)،4 מאי1975 ،

**- بەزمانی عەرەبی**

- **العرب(جريدة)،**

- الاستاذ البزاز يتلو بيان الحكومة حول سياستها في شمال الوطن، ع(613)، 30 حزيران 1966.

**_كتێب**

**بەزمانی کوردی**

- عەبدوڵڵا، فەرەیدوون عەبدولڕەحیم.( ٢٠٠٨)، بارودۆخی سیاسی کوردستان- عێراق (١١ی مارت ١٩٧٠-١١ی مارتی ١٩٧٤) ،هەولێر،
- کەریم، د. مستەفا محمەد.(٢٠٢٢)، شۆڕشی دووەمی بارزان هۆکار و دەرئەنجامەکان(١٩٤٣-١٩٤٥)، هەولێر،
- محمد، کاروان جەوهەر.(٢٠١٩)، ئیدریس بارزانی(١٩٤٤-١٩٨٧) ژیان و ڕۆڵی سیاسی و سەربازی لە بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورددا توێژینەوەیەکی مێژووییە، هەولێر.

**بەزمانی عەرەبی**

- البياتي، عبدالرحمن أدريس صالح.( 2007)، الشيخ محمود الحفيد(البرزنجي)و النفوذ البريطاني في كردستان ، دار الحكمة ، لندن،

- الدوسكي، هوزان سليمان. (2005)، جمهورية كوردستان(دراسة تاريخية-سياسية)،أربيل.
- السمر, عمار علي.( 2012)، شمال العراق(1958-1975)، دراسة سياسية، المركز العربي للآبحاث و دراسة السياسات،
- العاني، د.نوري عبدالحميد ،وأخرون.( 2000)، تاريخ الوزرارات العراقية في العهد الجمهوري (14تموز 1958- 7 شباط 1959)، ج 1، بغداد.
- غلام،اسراء نورى.( ٢٠٢١)، الكرد الفيليون فى العراق جدلية المواطنة وتراجيديا التهجير، دمشق.
- فرحان الجبوري، مهند علي.( ٢٠١٧)، الشيخ أحمد البارزاني وأثره الاجتماعي والسياسي في كردستان العراق 1896-1969، دار سپيرێز، دهوک،
- كوماروف، د. دينيس، (2005)، البارزاني و نضال الاكراد الجنوبيين، في: البارزاني و شهادة ألتاريخ (مجموعة أبحاث و أنطباعات للمولفين الكورد والروس)، ت: د. بافي نازى، عبدي حاجي، سيبريز، دهوك،
- وانلي، عصمت شريف.( 2012)، كردستان العراقية هوية وطنية (دراسة في ثورة 1961)، ت:د. سعاد محمد خضر، مطبعة شڤان، السليمانية.

**بەزمانی ئینگلیزی**

- Harry,Fitless, (1966), History of the cooperative movement in Israel, London.
- John,Lavin. (1979), The Israeli mind,London.

**بەزمانی روسی**

- O.I. Zhigalina. Мулла Мустафа Барзани (историческое фото), Институт востоковедения, Москва, 2013.

**بەزمانی عیبری**

- שפירא, ניטה. (1977).המאבק הלא מוצלח: יצירות עבריות (1929-1933)، מכון חיים ויצמן ללימודי ציונות.

**القضية الكردية في صحيفة دافار الإسرائيلية (1970-1975)**

**قارەمان حيدر رحمان**
بەشی مێژوو، کۆلێژی ئاداب ، زانکۆی سەلاحەدین-أربيل
qaraman.rahman@su.edu.krd

**نوشيروان شريف سعيد**
وزارة شؤون الشهداء والمؤنفلين في كردستان
nawsherwansaeed@gmail.com.

**ملخص**

تعد صحيفة دافار من أهم الصحف الإسرائيلية منذ تأسيسها عام 1925، والتي خصصت مساحة كبيرة للقضية الكردية. وذلك باستخدام معلومات من مصادر مختلفة، مثل وكالة أسوشيتد برس، أو القنوات الإعلامية للحكومة العراقية والثورة الكردية، بما في ذلك صوت كردستان العراق. وأحياناً يقوم مراسلو الصحيفة في العواصم الأوروبية والأميركية وفي الشرق الأوسط، مثل بيروت وطهران، بإعداد تقارير صحفية حول الموضوع. ولتحقيق هذه الغاية، قام هذا المقال إلى أنه يعرض القضية الكردية من منظور الصحيفة الأكثر مبيعاً في إسرائيل. وخلال هذه الفترة التاريخية، كانت البلاد في صراع سياسي وعسكري مع الدول العربية بشكل عام، وخاصة مع العراق وسوريا، التي تضم جزءا من المناطق الكردية داخل حدودها. ويعود سبب كتابة المقال إلى عدم وجود أي بحث علمي حول موقف الصحافة الإسرائيلية من القضية الكردية، في الوقت الذي كانت فيه القضية ذات أهمية كبيرة للصحافة العالمية خلال هذه الفترة التاريخية. ومن الواضح أننا في هذه الدراسة نعمل على الإجابة على سؤال وهو مخرجات الموقف السياسي للصحافة الإسرائيلية على المجتمع اليهودي، وخاصة الأكراد في هذا البلد، الذين كان الكثير منهم الأصلهم من كردستان العراق بعد عام 1948 انتقلوا إلى إسرائيل.

**الكلمات الرئيسية:** العراق، القضية، الاكراد، إسرائيل، صحيفة دافار.

**The Kurdish Issue in The Israeli Newspaper Davar (1970-1975)**

**Qaraman Haidar Rahman**
Department of History, College of Arts, Salahaddin University-Erbil
qaraman.rahman@su.edu.krd

**Noshirwan Sharif Saeed**
Ministry of Martyrs and Anfal in Kurdistan
nawsherwansaeed@gmail.com

**Abstract**

Davar newspaper is one of the most important Israeli newspapers since its founding in 1925, which devoted a large amount of space to the Kurdish issue. This is done using information from various sources, such as the Associated Press, or the media channels of the Iraqi government and the Kurdish revolution, including the Voice of Iraqi Kurdistan. Sometimes the newspaper's correspondents in European and American capitals and in the Middle East, such as Beirut and Tehran, prepare press reports on the subject. To this end, important work has been done by the newspaper's writers and correspondents, such as Ehud Yaari, Sovir Davar, Jack Murray, Dietrich Strootmann, and Poror Sheinberg. The importance of this article is that it presents the Kurdish issue from the perspective of the best-selling newspaper in Israel. During this historical period, the country was in a political and military conflict with Arab countries in general, and especially with Iraq and Syria, which included part of the Kurdish regions within their borders. The reason for writing the article is the lack of any scientific research on the position of the Israeli press on the Kurdish issue, at a time when the issue was of great importance to the international press during this historical period. It is clear that in this study we are working to answer a question, which is the consequences of the political position of the Israeli press on the Jewish community, especially the Kurds in this country, many of whom were originally from Iraqi Kurdistan after 1948 and moved to Israel.

**Keywords:** Iraq, Kurdish, issue, Israel, Davar newspaper.